


# گۆزەی شکاو
# عەتتار

**بەرکوتێک لە خەرمانی ئەدەبی کۆن**

**رەسووڵ ڕەش ئەحمەدی**

(هەڵوەدا مهابادی)

**زنجیره کتیبی کەلەپووری**
**ئینستیوتی کەلەپووری کوردستان**
**ژمارە (14)**

خاوەنی ئیمتیاز: **وەزیری رۆشنبیری**
سەرنووسەر: **هەنگاو ئەنوەر شیخانی**
hangawanwar@yahoo.com

سەرۆکی ئەنجومەنی ڕاوێژکاری: **پ.د. شوکریە رەسووڵ**
ئەنجومەنی ڕاوێژکاری: **د. محەممەد عەزیز زازا**
chakerzaza@yahoo.com
**مەحموود زامدار**
**سالار عوسمان**
**سدیق خالید**

ناوی کتیب: **گۆزەی شکاو**
نووسینی: **عەتتار نەیشابووری**
وەرگێرانی: **رەسووڵ رەش ئەحمەدی** (هەڵوەدا مهابادی)
دیزاینی بەرگ: **ئاسۆ مامزادە**
سەرپەرشتی چاپ: **عیماد رەشید پیرداود**
چاپ: **چاپی یەکەم2006 / هەولێر**
تیراژ: **1000 دانە**
**چاپخانەی دارا**
لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارەی سپاردنی (25) ساڵی 2007 ی دراوەتێ

---

**ناونیشان: هەولێر/ ژێر زەمینی کتێبخانەی گشتی هەولێر/ بەرامبەر وەزارەتی تەندروستی**
**تەلەفۆن: 2238301 – 2238302 – 2519558**

## بەناوی سەرچاوەی
## چاکی وپاکی ودڵۆڤانی

لە کاتێکدا کەسێک جامە ئاوێکت بۆ بێنێ و لەو تێنویایەتیەدا نەجاتت دا چی دە دەیێ؟

خەڵیفە گوتی: پرسي نی ناوێ حازرم نیوەی سەروەت و دەسەڵاتی خۆمی دە دەمێ یادی بەخێر، ئەوکاتی مناڵ بووم وقوتابی، هەرکات لەوانە واتە بڵێین درسی فارسیدا دەگەیشتینە شێعرێک، لەچاودەرسەکانی دیکە قلی وبلیمان دە دڵی دەکەوت، چونکی کورت وکەم بوو و مەشق و نوسینی شەوانەمان زووکۆتایی پێدەهات تەواوکەیفساز دەبووین، مامۆستاکانیش تیژ لەو دەرسانە تێ نەدەپەڕین وهەتا تەواو ئەو شێعرەمان لەبەر نەکردبا نەدەچونە سەر دەرسێکی دیکە.

دەبەشی کۆتایی ئەو شیعرانەدا کەبەعام تەکلیفی شەوی دووهەمیان پێ دەگوت دەنوسرا: ئەو شیعرەی بکەنە نەسروبەبۆچوونی خۆتان مانای لێ بدەنەوە و بۆ هاوپۆلانی خۆتانی بخوێننەوە.

تەکلیفی شەوی دووەم دەڕاستیدا جێی دەرسی ئینشای ئەورۆی پڕ دەکردەوە و مامۆستاکانی ئەو دەم بایخێکی زۆریان بەو بەشەدەدا، منیش یەکێ لەو قوتابیانەبووم کەهاتبوومە سەر ئەو باوەڕە کەمانای شیعرو مەبەستی شاعیر بەشی هەرەگرینگی شیعرە

و دە مانا کردنەوەدا دەبێ ئەو خاڵە پیرۆزە کە دەڕاستیدا بووە بەهۆی گوتران وخوڵقانی ئەو شیعرە بدۆزرێتەوە و بپارێزرێت، زۆر دڵبەستە وبڵێین عەلاقەمەندانەکاغەزم بۆخەتکێشکاری دەکردو دەوروبەری نوسراوەکەم بەکێشانەوەی چەند گوڵ و باڵندە دەڕازاندەوە شانم وەبەر دەداو تینم وەبەرە خۆم دەنا وپێچەوانەی زۆر مەشق و نوسینەوەی دیکە ئەو کارەم زۆر بەئیشتیاوە ئەنجام دەداو لێی وەڕەز نەدەبووم.

بەڵام زۆر جار دەکەوتمە بەرشات وشوت و گازندەی مامۆستا، کەجارێکی دیکەبۆخۆم بنووسم و لەم ولەو یارمەتی وەرنەگرم، ئەگەر سوێندم خواردبا کەبۆخۆم نوسیومەئەوە لە جیاتی باوەڕ پێکردن و هەموو

ئافەرین و بارەقەڵڵایەک سێ چوار زڵلەی تەڕویر و ئاو داری لەبناگوێم ڕادەکێشا، جادەڵێی چی؟ ئەو زەمان دەیانگوت: لێدانی مامۆستا بۆ قوتابی نان وکەبابە ولە بەهەشتەوە هاتووە.

زۆرجار بەجورمی ئەوی بۆچوون و قسەکانم لەقەدەر تەمەنم نەبوون دار کاری دەکرام، بەڵام من لەو بارەوە ڕووم داماڵابوو و چ گوێم بەو لێدان وکوتانانە نەدەبزوت ولەوەی دەمکرد پەژیوان و پاشگەز نەدەبوومەوە.

دە دەور و زەمانی منالی ئێمەدا باوباوی چەند حەکایەتی دیاریکراوی وەک ئەمیر ئەرسەلان وئەسکەندەر نامەو ڕۆستەم نامەو شێرۆیەبوو، ئەوانەشمان هێندەگوێ دابونێ کەبەتەواوی تێیاندا ببوینەحەکایەتخوان و ئەگەر لێیان ویستباین سەرلەبەر دەمانگوتنەوە.

زۆرجار دەگەڵ هاوتەمەنان لەشوێنێک کۆدەبوینەوەو دەمانکردەبازاڕی خۆمان،داوامان لە یە کتری دەکرد تا حەکایەتێک بۆ یەکتر بگێرینەوە،کاتێ نۆبەم دەهات دیارە جگەلەو حەکایەتانەی کەبیستبووم هیچی دیکەم نەدەزانی وئەوانیش جگەلەوە چاوە ڕوانییەکیان لێم نەبوو، بەڵام دانم بەو نەزانینەی خۆمدا نەدێناو هەروا لەخۆڕا سەرەتای حەکایەتێکی تازەو سەر بەخۆم دادەمەزراند و باش و بەڕێ وجێ کۆتاییم پێ دێنا، زۆرجار وەسبەینێ ڕا داوایان لێدەکردم هەتا حەکایەتەکەی دوێنێ یان دوبارە بۆ بگێرمەوە، لەبیرم نەدەما چۆنم گوتووە، وەک دوێنێم دەست پێدەکرد و جورێکی دیکەم کۆتایی پێ دێناوە و بەقەولی مەشهوور ئەوی دەمگوت نەمدەگوتەوە.هیچ شتێ دەو دنیایە دا وەک زەینی منداڵ نەخش هەڵگرنییە، بەو مەرجەی بواری بدرێتێ ودمکوت و سەرکوت نەکرێتەوە دەتوانێ نەک هەر هەڵگرو وەرگری شتی کۆن بەڵکوو دانەرو داهێنەری زۆر بۆچونی تازەو نوێ بێ.

دەساڵەکانی دواتر دا هۆگریم کەوتەسەر کتێبە ئەدەبییەکان و عەلاقەیەکی تایبەتم بەعەتتاری نەیشابووری پەیداکرد، هۆی ئەو عەلاقەش دەگەڕاوە سەر ئەو نەقڵ و نەزیلانەی کەدەو کتێبانەدابوون و پێشتر لەزمانی پیرە پیاوەکان بیستبوومن ولەڕوانگەی خۆمەوە بەفۆلکلۆرم دەزانین، هاتمەسەر ئەوەی وەک چۆن دەدەورانی منداڵیدا شێعرەکانم دەکردنە نەسرو دەسخۆشانەم لە مامۆستا وەردەگرت ئەو نۆرەیەش لەدەرفەتی بێکاری کەڵک وەرگرم و بەشێوەی حەکایەت و نەسرێکی ڕەوانیان دەرێنم و پێشکەش بەکتێبخانەی کوردییان بکەم.

ساڵی پەنجاو نۆ بۆشێست و ئەولاتر دەمی سەرقاڵی من بەو کتێبەوە بوو ساڵانێکی زۆر ناخۆش بەتایبەت بۆ قەڵەم بەدەستان بوون، هێشتا حاڵی نەببوین وتێنەگەیشتبووین کەتا چ ڕاددەیەک دەنوسیندا ئەویش بەتایبەت بەزمانی خۆمان ئازادین.

بەو بۆچوونەوە دەستم کرد بەپشکنینەوەی کتێبەکانی عەتتارو کۆمەڵێک داستانی تەڕویرم لێ هەڵبژاردن و لەشیعررا کردمنەنەسرو و بەکەیفی خۆم شاخ و باڵم وێخستن، کاتێ لەکارەکەم بوومەوە دیتم دەنێو فارسەکاندا کەسێک بەنێوی مێهدی ئازەر یەزدی بەر لەمن ئەوکارەی کردووە، کتێبەکەیم پەیدا کرد و بەوردی خوێندمەوەودەدڵی خۆمدا ئافەرینم پێ گوت و ئەوپەڕی کەڵکی خۆمم لێ وەرگرت وبۆچونەکانی خۆمم تێکدا ناواخن کرد و ئەو بەرهەمەی لێ پێک هات کەهیوادارم بەبەرهەمی ساڵانی سوتاوی تەمەنمی بزانن و عەیبەکانیم بۆداپۆشن.

ئەوداستانانەی کە دەوکتێبە دا دەیانخوێننەوە دەڕاستیدا نزیکەی شێست وانەو دەرسی ئەخلاقین کەدەکرێ بۆ مناڵان ڕێ نیشاندەر بن و بەرەو چاکەو چاکەکاری کەبەڕاستی دەبێ دروشمی هەمووئینسانێک بێ هانیان بدەن، بەجێیەگەورەکان ئەو داستانانە بەوردی بخوێننەوە، پاشان دەهەل ودەرفەتی گونجاودا بەڕاوێژی لەبار وەک حەکایەت بۆمناڵانی خۆیانی بگێرنەوە، بەدڵنیایی شوێنی باشیان لەسەر دادەنێ.

ئەورۆ وەک دەبینین لەو وڵاتانەی کە بایەخ بۆ ئەدەبی مناڵان دادەندرێ نوسراوەکانیان لەڕوی تەمەنی وانەوە دەستەبەندی کردووەو هەردەستە لە نوسراوەکان تایبەتی تەمەنێک دەنوسرێن کەهیوادارم دەداهاتودا دوای سەقامگیر بوونی زمانی یەکگرتوو ئەو خاڵە گرینگە وەبەرچاو بگرترێ.

بەڵام بەو حاڵەشەوە دەبێ ئەوەمان لەبەرچاوبێ کەڕاددەی حاڵی بوون و تێگەیشتنی مناڵانی هاوتەمەنیش بەیەک ئەندازەنییەو هەموویان یەکجور و یەک ئەندازە لە بەرهەمێک کەڵک وەرناگرن و یەک میزان لێی حاڵی نابن.

ناسینی ئەوکەسەی بۆی دەنوسی یا شارەزا بوون بەسەر ڕاددەی تێگەیشتنی ئەودەماناى وشەکان شەرتی بنەڕەتی کاری فێرکردنە، ڕاشکاوانە دەبێ پێ لەو ڕاستییە بنێین کەهیچ کەس بەئەندازەی دایک

و باب منالّی خۆی ناناسێ و لەڕاددەی تێگەیشتن و شارەزایی ئەو لەزمان حالّی نییە، یاڕونتر بلّێم ئەوەدایک وباب وچوارچێوەی ماڵ و ئەو شوێنەی کەمنداڵ تێیدا پەروەردەدەبێ یەکەفراوانی بازنەی ئاشنایی منداڵ دەگەڵ وشەکان بۆ حالّی بوون لەمەبەستێک دیاری دەکا.

کەوایە دانەدانەی دایک و بابەکان دە بەڕامبەر منداڵەکانیاندا بەرپرسیارن و پێویستە هەرکات مەبەستێکی بەسودو بەکەلکیان بیست بەو زمانەی کە منالّەکەیان لێی حالّی دەبێ بۆی دووپات کەنەوە، بەتەجرەبە وئەزمون دەرکەوتووە ئەوکەسانەی کە بە منداڵی حەکایەتیان بۆکردوون ودایک و باب حەمیەتیان وێداون و جگە لە دابینکردنی نان و بەرگ دەبیری پەروەردەکردنی مێشکیشیان دابوون دەتەمەنی گەورەیی داکەوتوونە دوای متاڵاو کتێب خوێندنەوە، بەوئاواتەی ڕۆژێک لەڕۆژان شاهیدی قەدری قەڵەم دەکۆمەڵگاکەماندا بین و خوێندن و زانین و تێگەیشتن بەردی بناغەی کەسایەتیمان بێ.

بەئاواتی تێگەیشتن بۆ پێگەیشتن
ڕەسووڵ ڕەش ئەحمەدی مهاباد
هاوینی 1365

# زاوای زانا

دەرۆژگاری زۆرکۆندا، حاکمی یەکێک لەشارەکان، بەرواڵەت لێزان و تێگەیشتوو خاوەنی کچێکی باش و گوێ لەمست بوو. چاکی و جوانی ئەوکچەببووە هۆی ئەوە کە لەهەموو لایەکرا بێنەخوازبێنی.

بەڵام هەموو جار، داخوازی خوازبێنی کەران بەگوێی نزیکانی حاکم رادەگەیشت و ئەوانیش نەیاندەوێرا ئەو جۆرەی پێویستە دەق و دۆغری حاکم لەو مەسەلەیە ئاگادار کەن. بەڵام هەر کە کورتەباس و ئاماژەیەکیان بەو مەسەلەیە کردبا، حاکم زوو حاڵی دەبوو و زیرەکانە باسەکەی دەگۆری. رۆژێک حاکم لەو هەموو سرت و خورت و مینگە مینگەی دەورو بەریان وەگیان هات و گوتی: وا باشەهیچ لایەکمان زۆری قەراغ لێ نەکێشین  وئێوە راستەو راست و بێ پێچ و پەنا قسەی من ببیسن.

بەهەموو خوازبێنی کاران رابگەیێنن: کچەکەم ئامادەی شوو کردنە، بەڵام کەسێک دەتوانێ ببێتەزاوای من کەلەهەمووخوازبێنی کارەکان تێگەیشتووتر بێ. هەموو رۆیشتن و ئەو هەواڵەیان بەخزم و دۆستانی خۆیان راگەیاند، تا دەوکێ پرکێ یەدا بەشداری بکەن، بەڵکوو ببنە زاوای حاکم و لەو رێیەوە بەماڵ و نەوایەک بگەن.

کاتێ ئەو باس و خەبەرە دە شاروو ناوچەدا بڵاو بۆوە لەو هەموو خوازبێنیکەرانەتەنیا سێ کەس دەخۆیان ڕادی دەو تاقیکارییەدابەشداری بکەن و لەترسی ئەوەی کەنەکا تووشی دەردی سەر بن و نێوی گێل و نەفامیان لەلایەن حاکمەوەبەسەردا ببڕێ بڵاوەیان کرد،  ئەو سێ کەسە بەیانی زوو لە بەرامبەر حاکمدا ڕاوەستان و ئامادەیی خۆیان بۆ ئەو تاقیکارییە ڕاگەیاند.

حاکم گوتی: وادیارەلەو هەموو خوازبێنی کارانە تەنیا ئەو سێ یانەتان ئەویندارى راستین و دەمەیداندا ماونەوە! من ئەورۆ سەرحاڵ و

ڕازیم و بڕیارم داوەکچەکەم لەیەکێکتان مارە بکەم، بەڵام من وەک حاکمێک هێندێکم شەرت و مەرج بۆ ئەو کارە داناوە، هەرکام لەئێوە توانیتان ئەو شەرت و مەرجانە بەجێ بێنێ، ئەو کەسە دەبێتە زاوای من.

شەرت و مەرجی من بەو جورەیە: هەرکام لەئێوە کە خوازبێنیکار بێ دەستوور دەدەم لەو کۆڵەکەیە بتانبەستنەوە، پاشان فەرمان دەدەم بەکەیفی خۆم و هەتا دەڵێم بەسە، لێتان دەن و بتانکوتن تاوەکوو دووکەستان دەژێر لێداندا دەمرن، ئەو دوکەسەتان کەدەمرن خوا لێتان خۆش بێ، من کچی خۆم دەدەم بەو نەفەرەسێهەمییەی کەزیندوو دەمێنێ، بەڵام ئەو کەسەی کەمن کچەکەمی دەدەمێ و دەبێتە بەزاوای من،ئیزنی نییە دەو شارەدا بمێنێتەوە.

دەبێ ماڵی بچێتەجێیەک کەمن بۆی دیاری دەکەم، نابێ چاوی لەماڵ و دارایی من بێ، دەبێ بەدەسترەنجی خۆی ژیانی ژن و منداڵی بەڕێوەبەرێ، ئیجازەی نییەسەری ئێمە بداو لەهیچ جێیەک نابێ خراپەمان بڵێت، بێت و بزانمەوەو ببیسمەوە کەدەگەڵ کچەکەم خراپە بەو شیرەی بەدستمەوە لەنێو راست ڕا شەقەی دەکێشم، ئەگەر زۆر زۆری مایە بۆ دانێم، لەجیاتی شەقەکێشان سەری لەلەشی جیا دەکەمەوە.

جا ئێستا ئێوە سەرو کاغەزێکتان دەدەمێ و نیو سەعاتتان ماوە دەدەم ئەگەر لەسەر ویستە کەتان هەروا سوور مانەوە ڕای خۆتان لەسەر ئەو کاغەزە بنوسن، بەڵام هەرکام لە ئێوە پاشی ئەو قسانەی من، ئەگەر لەویست و داخوازی خۆی پەژیوان و پاشگەز بێ، دەبێ لەو وڵاتە بڕواو هەرگیز نەگەڕێتەوەو لەهیچ شوێنێکیش بەخراپەباسمان نەکا، دەنا وەک مۆتە دەگەمەسەری و حەیاتی ڕەشی لێ دەبڕم.

ئەوکات دەستوری دا هەرکامیان دەدیوێک کردن، دەرکەیان لەسەر داخستن و پاشی نیو سەعات، مەلا و قازی و زانایان ئامادەبوون.

حاکم دەستوری دا دەرکەیان لێ کردنەوەو کاغەزەکانیان لێ وەرگرتنەوەتا بیانخوێننەوەو لەبیر و ڕایان حاڵی بن.

کاغەزی یەکەمیان خوێندەوە، نوسرابوو: ئێستا کەوای لێهاتووە هەرچەند بۆ من زۆر سەخت و دژوارەو تەنانەت لەمەرگیش بەخراپتری دەزانم، بەڵام بەچاوان هەوڵ دەدەم تا بیستو چوار سەعاتی دیکە لەو

وڵاتەیرۆم و هەرگیز ئاورنەدەمەوە، بەڵام تکام ئەوەیە، پاش رۆیشتنی من حاکم کاری بەخزم وکەس وکارم نەبێ و ئەزیەت و ئازاریان نەدا و بەخاتری هەڵەیەک کە لەمنەوە ڕویداوە بەربینگ بەوان نەگرێ، چونکی ئەوە ناماقوڵی یەکەکەتەنیا من بۆ خۆم کردوومەو ئەوان ئاگایان لەو حەیسەو بەیسەی نەبووە.

حاکم وکچەکەی لە خوێندنەوەی ئەوکاغەزە تەواو پێکەنین و گوتیان: ئەو خوازبێنیکەرە کابرایەکی ترسەنۆک بوو کەتەنیا بۆتەماح و وەدەست هێنانی ماڵی دنیا هاتبووپێش، با یرواو هەرگیز نەگەڕێتەوە.

دەکاغەزی نەفەری دوهەمدا نوسرابوو: هەموو هەل و مەرج و شەرت و شروتەکانم قبوڵە، ئەگەر هاتو دەژێر جەزرەبەی حاکمدا زیندومام ئەوە بەئاواتی خۆم دەگەم، ئەگەریش مردم، ئێوەخۆش، لەدنیای دیکەچاوەڕوانی دەمێنم و دڵم هەروا بەدوایەوەدەبێ و ژیانم بێ خۆشەویستی ئەو بەهیچ رەنگ و تام و بۆنێکەوە ناوێ. یا مەرگ یا کچی حاکم.

حاکم ڕووی دەکچەکەی کرد و گوتی: دەڵێی چی ؟

کچەکەگوتی: بابە پرسینی ناوێ، ئەوە بە عالەم ئاشکرا شێتێکی بەتەواو مانایە، ژیان دەگەڵ هاوسەر و مێردی شێت زیندانە.

حاکم گوتی: ئافەرین رۆڵە، باشی لێ حاڵی، ئەو کابرایە بەڕاستی شێتە، هەر بەخاتری ئەوەی بگاتە ئاواتی، ئامادەیە ببێتە بەندەو زێرخەریدی ئێمەو تا ئاخری عومر بەترس و خۆفەوە ڕاییبوێری و نەتوانێ دەهیچ بارودۆخێکدا لەگوڵ کاڵترت پێ بڵێت. ئەوەش گومان ناکەم دەژیانی ژن و مێردایەتیدا بگونجێ، باش وایەئەو کابرایە بچێتە شێتخانەیەک و چارەی دەردی خۆی بکا، ئەوەئاشق نییە، شێتە، با یرواو لەبیرمان بەرێتەوە ئێمەش لەبیری دەبەینەوە.

کاغەزی سێهەمیان خوێندەوە: جەنابی حاکم من ئامۆزایەکم هەیە، زۆر جوانە، هیچ عەیبێکی تێدا نابینم، ژیرو تێگەیشتوویە، بەڵام بۆخۆم پێم وایەکە دەگەڵ کچی تۆ بەختەوەرتر دەبم، هاتوومەخوازبێنی، خۆنەهاتوومە شەر، لەئێستاوە شیر و تیرم لێدەسووی! شارو وڵاتی خۆم وا بەهاسانی بەجێ ناهێڵم، بەڵام ئیدی حیسابی زۆری شتێکی دیکەیە.

یەکەودوای ئەوەجائەوەچ زەماوەندێکە؟ پاش لێدانێکی زۆر، ژیان لەجێیەکی نادیار، ئەویش بەترس و لەرزەوە، لەوەی کەنەکا کچی تۆ دڵی لێم بێشێ و تۆ وەک مۆتە بگەیە سەرم، نەخێر نەوەڵڵا ئەوەکچ بەمێرددان نییەئەوەدوژمنایەتییە، دەبێ رێگایەکی بۆمن بێڵێوە دەناخۆشێت نەبووم، دەڕۆم ئامۆزاکەی خۆم دەخوازم و ژیانێکی بێ دەردەسەر دەست پێدەکەم، بەوجورەی دەفەرمووی کچەکەت قەت هەست بەبەختەوەری ناکا.

دەبێ لەوەی نوسیومە لێم ببووری، بەختەوەری خۆت و کچەکەت ئاواتمە.

حاکم ڕوی دە کچەکەی کردوگوتی: دەڵێی چی؟

کچەکەگوتی: هەرچی تۆبفەرمووی، ئیدی کەس نەماوە.

حاکم پێکەنی و گوتی: زۆرباشە، ئەو لاوە تێگەیشتوویە، دەزانێ کەدەگەڵ ئامۆزاکەی خۆی هیچ جیاوازییەکت نییە، بەڵام پێی وایەکەدەگەڵ تۆبەختەوەرتر دەبێ، ئامادە نییەلەترسان دەربەدەربێ، شێتیش نییە ناچێتە ژێر باری زۆری ئێمە، ئەو لاوە زاوایەکی زانایە، منیش ئەو قسانەم تەنیا بۆ بەختەوەری تۆ بوو، ئێستا ئامادەم بێ هیچ پەڵپ و بیانوویەک تۆی لێ مارە کەم، ئەڵبەت بەو مەرجەی کەدوای ئەو قسانەی ئێمەهەروا لەسەر داخوازێکەی سووربێ.

لاوەکەگوتی: من بەهومێدو ئارەزۆوە پێم ناوەتەئێرە.

کچەکەش گوتی: دیتنی تۆ و بیستنی قسەکانت منی بەژیان هیوادار کردووە.

حاکم کەئەوەی بیست، بێ هیچ بیانویەک بەشاهیدی حازریان، کچەکەی لەوکورە مارە کرد و بۆیان لەخوا پاڕاوە تا دەژیاندا بەختەوەر بن.

# دۆستی دوژمن

حاکمێک لەنێو دەیان و سەدان غوڵامی خۆیدا، یەکجار زۆر ڕمودەی غوڵامێکی جوانچاکی ببوو، بەجورێ کەقەتی لەخۆی جیا نەدەکردەوە.

لەڕاوو شکار، سەفەر و بارەگا و تەنانەت لەحەرەمسرا، بەکورتی چووبا هەر جێیەک دەگەڵ خۆی دەیبرد و تاقە ژەمێکیشی بێ ئەو نەدەخوارد.

ڕێز و ئیحترامی ئەو غوڵامە بەڕاددەیەک بوو کەتەواوی ئەمیران و وەزیران و کار بە دەستانی وڵات بەخیلیان پێوەی دەربرد و دەیانبوغزاند، بەڵام سەرەڕای ئەو هەموو خۆشەویستییە، کە لە هەندەران ڕا میوانێکی ماقوڵی هاتبایەبۆ نیشاندانی ئەنگێوەیی و دەست ڕاستی خۆی دەتیرهاوێژیدا سێویکی لەسەر تەپڵی سەری ئەو غوڵامەدادەنا و بە نیشانە دایدەکرد.

هەموو جارێ دەنگی ئافەرین دەقەسردا دەنگی دەداوەو حاکم لەخۆشی نیشانەئەنگێوی و دەست راستی خۆی فیکەی سـمێڵانی دەهات.

بەڵام غوڵامی بێچارە، رۆژبەرۆژکزتر و بێ هێزتر دەبوو، بەجورێ کەدەو دوایانەدا جگە لە ئێسک و پێست هیچی دیکەی لێ نەمابۆوە، دڵەکوتەو نۆبەتێ ودەیان نەخۆشی دیکەی پێوە نوسابوو، یەکێک لەبەغیلانی بێ خەبەر ڕەخنەی لێگرت وگوتی: بەڕاستی سەیرە، تۆ قەدری ئەو هەموو چاکەی حاکم نازانی، ڕەنگ و ڕووی خۆت بۆچی ئاوا زەرد هەڵگێراوە؟

غوڵام گوتی: سەڵا لەئەقڵی ناتەواوت، کورەچاکەی چی؟!

کابرا زۆری پێ ناخۆش بوو گوتی: ئەی سپڵەی پێ نەزان، ئێمەدەمانزانی غوڵامێکی وەک تۆ شیاوی ئەو هەموو رێز و ڕوو پێدانە نییە.

غوڵام گوتی: چی بەسەر چێوە؟!

من هەرچی رۆژە خۆم دەبەرامبەر مەرگا دەبینم، دەزانم ئەگەر تیرەکەی وەنیشانەکەوت ئەوە لەبەخت و کارزانی و نیشانەئەنگێوی حاکمەوەیە، بەڵام ئەگەر خوانەخواستە تاقە نۆرەیەک، نەی ئەنگێوێ و تیرەکەی نەختێ هەتڵەبێ؛ وەنێوچاوانی من دەکەوێ، ئەوکات دەخوێن و خوری خۆم دەگەوزێم و هەرگیز ڕووی ژیان نابینمەوە، ئەوکات بۆ حاکم شتێک نییە، غوڵامێکی بێ قابیل لە دەست دەدا، گریمان کردم ئەو غوڵامەقەت نەدەبوو، پرۆکاکی خۆم بەسەری تۆ دۆستی وا لەهەزار دوژمن خراپترە.

# هیممەتی هەژاران

منالێکی ڕەشـکەڵەی هەژار، باوکی لەدەسـت داو لەو کاتی ڕا ناچار بوو بۆ دابینکردنی بژیو وگوزەرانی ژیانی دایکی پیر وچەند خوشـک و برای وردو سـاوای ڕۆژانە بچێتە ڕەنی دەریا و درێژە بەکاری بابی بدا و خەریکی ماسـی گرتن بێ. ئەوکورە تا بڵێی زیرەک و زیت و وشیار بوو، بەڵام ڕۆژانە دەرفەتێکی بۆکایەی منااڵنە نەدەماوە، تا ئێواران لەقەراغ دەریا، ئارام و لەسـەرخۆ تۆرەچکۆڵەکەی دەئاو داویشـت و جوڵەی نەدەکرد. دنیای منااڵنەی تێکەڵاوی خەم وپەژارەو هەوڵ و تەقەللایە ببوو و دابین‌کردنی خەرجی ڕۆژانەی دایک و شـەش خوشـک و برایان کەبە خۆیەوە دەبونە هەشـت کەس، شـتێکی هێندەهاسـان نەبوو، هەموو ڕۆژ چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد بەڵکوو خوابکا ئەورۆ ماسـییەکی زۆرتر بگرێ و بتوانێ ڕۆژی دواتر بحەسـێتەوە، یا بەلانی کەمەوە ماوەیەک دەگەڵ منااڵنی هاوتەمەنی کەتۆزێک لەولاترخەریکی کایەبوون هەڵبزۆقێتەوە. بەڵام داخی داخان هەموو نۆران هەر ئەوەندەی پێدەگیرا، کەبەحاڵ و دوبەڵاو نەمر نەژی دایک و خوشـک و براکانی پێی بەڕێ بچن. دەو دنیا پان و بەرینەدا تەنیا دڵخۆشـی بەوە بووکەخۆی بەپیاوی ماڵێ دەزانی. ڕۆژێک سـوڵتان مەحـموود بۆگەشـت وگەڕان لەگەڵ دەسـت و پێوەندەکانی ڕێی کەوتەقەراغ دەریا، پاشـی پشـودان لەقەسری قەراغ دەریا و تێهەڵاتن و ئەنجامدانی کارەکانی دیکەی، حەوسـەلەی بەسـەرچوو سـواری ئەسـپەکەی بوو بەتەنیایی ملی لەگەڕانێ نا.

هەوا خۆش و دەریا دەوپەڕی ئارامی خۆیدابوو.

خەڵک خەریکی کاری خۆیان بوون، ماسـیگرەکان خەریکی هات و چۆ و منااڵن خەریکی کایەی منااڵنەو هێندێک خەریکی مەلەو تێهەڵاتن و تاقمێ لە بەڕبەڕۆچکەیا لەژێر سـابات وکەپرۆکانداخەریکی حەسـانەوەو

ژن و پیاوانی ئاوایی نشینی قەراغ دەریا لەمووچەو مەزراکانیان سەرقاڵی کاری خۆیان بوون.

سوڵتان هات، تاگەیشتە نزیک ئەو منداڵە ماسیگرەکە لەگۆشەیەکی چۆل و دوور لەچاوی خەڵک دانیشتبوو و جگەلەکاری خۆی هۆشی بەلای هیچ شتێکی دیکەوە نەبوو.

نزیک بوونەوەی ئەسپی سوڵتان کەبەسەر رەڵم و لیمی قەراغ دەریا دا دەهات منداڵەکەی وشیار نەکردەوە.

سوڵتان ماوەیەک راوەستا و تێی ڕاما، بەڵام منداڵەکە هەروا سەرقاڵی کاری خۆی بوو و بە دەنگێکی ناسک و خۆش لەبەرە خۆیەوە نارەی دەهات و بە چارەڕەشی خۆی هەڵدەگوت.

مەحمود تێگەیشت کەخەمێکی قورس وگران دەدڵی چوکی ئەومناڵەدا هێللانەی کردووە، زگی پێی سوتا، ویستی دابەزێ و دڵخۆشی بداتەوە. بەئەسپایی لێی نزیک بۆوەو پرسی: کوڕی چاک، بەتەنیایی لەقەراغ ئەو دەریایەخەریکی چی؟

کورەکەئاوڕی داوە، مەحمودی کەبەوئەسپ و بەرگ و لیباسەوەدی، زانی هەرکەس کە هەیە یەکێک لەگەورە پیاوانی دەوڵەتە، هەستا سەرپێ و سڵاوی کرد و جوابی بیستەوە.

خەریکی ماسی گرتنێم، وەبیرم دێ هەمیشە ئەوەکارم بووە، هیچ کات نەمتوانیوە وەک هۆو مناڵانە خەریکی کایەبم، ئەمن و ئەوانە دیوارێکی بڵیندمان دەمەعبەینی دایەو بارو دۆخی ژیانم لەگەڵ وان جیاوازە.

مناڵەکە بەو قسانە سەرپۆشی لەسەر هەموو خەمەکانی دەروونی لابرد ولێفەی لەسەر هەتیوان لاداو درکاندی کەژیانی وەک مناڵانی دیکەناچێ و دەبێ هەمیشەکار بکاو بەکایەی ڕاناگا.

**مەحمود گوتی:** خۆکایەکردن هێندەگرینگ نییە، ئینسان دەتوانێ بەتەنیاییش کایەی بکا.

**مناڵەکەئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:** بەڵام من دەبێ نان و بژیوی حەوت کەسان دابین‌کەم، دایکم و شەش خوشک و برا، ئاخر ئاغا، بابی من دە دەریا دا خنکاوە.

**مەحمود گوتی:** تێگەیشتم، دەی بڵێ بزانم رۆژێ چەند ماسیان دەگری؟

**کورەکەگوتی:** رۆژ دەزانێ، رۆژی وایەزۆر، جاری واشەکەم، هەرچی بێ لەهیچ باشترە، نەمرنەژی پێی بەڕێ دەچین.

ئاخر ئاغا ئێمە نامانەوێ سواڵ بکەین، هەر ئەوەندە کە دەست بۆکەس پان ناکەینەوە و لەبەر ئەم و ئەو نەپاڕێینەوەبۆ خۆی زۆرە.

**سوڵتان گوتی:** ئافەرین. تێگەیشتم، زۆر پیاوی.

لەپاشان فکری کردەوە بەڵکوو رێگایەک بدۆزێتەوە تا ناراستەو خۆ یارمەتی یەکی بکا، پرسی: حازری کارێک بکەین؟ وەرەبا ئەورۆ پێکەوەماسیان بگرین، تا ئێوارێ هەرچی گرتمان ئاخری وەخت بەشیان دەکەین.

**مناڵەکە، کەلە تەنیایی وەڕەز ببوو لەبەرە خۆیەوەگوتی:** ئەمیرێکی سەرو ڕووخۆشە، هەرچی بێ هاودەنگێکی خراپ نییە.

**سەری هەڵێناوگوتی:** زۆر باشە، بەڵام بەو مەرجەی پیاوانەو بەڕاست و دروستی بەشیان کەی وفێڵم لێ نەکەی و بەشەزۆرەکەی بۆخۆت هەڵنەگری.

سوڵتان گوتی: قبوڵە، هەر با بەشێک بۆ من و دوو بەش بۆ تۆ بێ.

**مناڵەکەگوتی:** وا نابێ، بەخشینی بەخۆڕایی هەمیشەعەیبێکی تێدایەمەگەر نەتبیستووە کوردان دەڵێن: ئەوماستەبێ موو نییە؟ من هیچ کات لەخۆڕا شتێکی لەکەس وەر ناگرم، برامان برایەتی و کیسەمان جودایەتی، نیوەی تۆ و نیوەی من، ئیدی بۆ کەم و زۆر بونیشی خوا کەریمە.

مەحمود لەقسەی پتوون و پیاوانەی ئەو منداڵەکەیفی ساز بوو گوتی: قبوڵم کرد، هەوساری ئەسپەکەی دە بەردێک هاڵاند و خۆی بۆ کار ئامادەکرد و گوتی: ئێستا هەر ماسییەک کە دەتۆرەکەت دابێ حەقی خۆتە، با ڕایکێشین و چی تێدابوو دەری بێنین و لەسەر ڕا تێی باوێینەوە، مەحمود و کورەکەتۆڕەکەیان لەئاو هێنادەر، بەڵام بەداخەوە هیچی تێدا نەبوو.

**سوڵتان گوتی:** لام وانییە بتوانین لەو قەراغەماسی بگرین. تۆرەکەی بەدەوری سەریدا هەڵسوراند و هاویشتێ قوڵایێ و لوێچێکی ڕەڵم وخیزی ورد بەسەر ئاوەکەدا پڕ ژاند و دانیشت، دەگەڵ مناڵەکەوتەدەردی دڵ و هێندێکی شێعر پێ خوێندەوە، ئینجا بۆ خۆشی چەند نەقڵ و نەزیلەی بەتام و بۆنی بۆ گێراوە و لەوەی توانیبوی

بۆ ماوەیەک هەوری خەفەت لەئاسمانی دڵی ئەو منداڵە چارە ڕەشەپرەوێنێ کەیفی ساز بوو.

**پاشی ماوەیەک مەحمود گوتی:** ئێستا وەختێتی، با تۆرکەی دەرکێشین.

بەهەردوکیان تێی نووسان، تۆڕەکە قورس و لیپاولیپ لەماسی بوو.

**منداڵەکەلەخۆشیان وەک کێچ هەڵبەزیوە:** خوایەگیان، سەت، هەزار، لە هەزاریش زۆرترە، تا ئێستا قەتم ئەوەندەماسی بۆ نەگیراوە، هەمیشە دوو یا سێ یا چوار، یا ئەوەی تۆرم بەبەتاڵی لەئاو دەرکێشاوە، ئەمیر ئەوە بەختی تۆیەئاوا باشە.

**مەحمود گوتی:** ناگیانەکەم، ئەوەی لەشانس و بەخت مەزانە، جاران تۆڕەکەت داویشتە قەراغێ، بەڵام ئەورۆ بردمانە قوڵایێ، جا ئەوەشتێکی ڕوونەجێی قوڵ ماسی زۆرترە.

**منداڵەکەگوتی:** دەگورج کەبەشیان کەین، هەر یەکی تۆ و یەکی من، خوا بەرەکەتی باوێتێ، بەزیاد بێ لەوەی زیاترم ناوێ.

**مەحمود گوتی:** نا. وا نابێ. رەسمی ئێمەو شەریکایەتی ئێمە دەبێ هەر رۆژە نارۆژێک بێ، خۆ من ئەورۆ بەتایبەت نەهاتبوومە ماسی گرتنێ، خەریکی گەڕانێ بووم بەسەر تۆداکەوتم، تۆریش ئی خۆت بوو، جێ راویشت بۆخۆت هەڵبژاردبوو، ماسی ئەورۆ با هەمووی ئێ تۆ بێ، سبەینێش هەرچی پەیدا بوو با بۆ من بێ، خۆ ئەوە هیچ عەیبێکی تێدا نییەو پێی ناڵێن بەخشینی بەخۆرایی؟

**منداڵەکەگوتی:** زۆر باشە، بەلانی کەمەوە دوو سێ ماسیان دەگەڵ خۆت بەرەوە با بە لانی کەمەوە منداڵەکانت بزانن کە ئەورۆ بێکار نەبووی و ڕاوێکت کردووە.

**مەحمود گوتی:** نانا، ئەندازەو حیسابی با لەخۆمان تێک نەدەین.

**منداڵەکەگوتی:** زۆر باشەبا قسەی تۆبێ، ئەوەمن خەرجی چەند رۆژانم بەباشی بۆ پەیدا بوو، بەڵام لەبیرت بێ سبەینێش هەر شەریکین.

**سوڵتان گوتی:** دڵنیا بە بەیانی زوو لێرە چاوەڕێتم، جارێ لای تۆخۆش.

سوڵتان ڕۆیشت و مناڵەکەی بەدڵخۆشی بەجێ هێشت، مناڵەکەش بەپەلەچوو بانگی ماسی فرۆشی کرد وماسی یەکانی لەسەرێک پێفرۆشت.

ماسی فرۆش بەسەر سورماوی دەو هەموو ماسییەفکری، **مناڵەکەگوتی:** تازە ئەوە دەو دنیایە دەگەمر، خوائەورۆ شەریکێکی بۆناردم هەرچی گرتمان بوو بەئی من، بەڵام ئیدی ڕاوی سبەینێمان، من هیچ بەشم تێیدا نییە.

بەیانی دروست دەکاتی دیاری کراودا سوڵتان نێو و نیشانی کورە ماسیگرەکەی دا بەیەکێک لەمەعمورانی نزیکی وگوتی: پڕۆ پێی بڵی شەریکەکەی دوێنێ دەڵێ هەتا ئێرەبێ.

مەعمور هات و منداڵەکەی دە مەسەلەکە گەیاند، دەپێشدا هێندێک ترسا، بەڵام کەزانی شەریکەکەی دوێنێی سوڵتان بووە، **دەباڵ خۆیداگوتی:** خۆهیچم نییەبترسم لێمی بستێنێ، دوێنێش خۆ پیاوێکی خراپ نەبوو، دە شەریکایەتی و پیاوەتیدا هۆی داوە.

تۆڕەکەی هەڵگرت و ڕەگەڵ مەعمورەکەکەوت، وایدەزانی کەئەورۆش دەبێ کاریان ماسی گرتن بێ، بەڵام هەرکەگەیشتێ، **سوڵتان بەخێری هێنا و پرسی:** لەسەرپریاری خۆت ماوی؟

**مناڵەکەگوتی:** خۆم پێ پیاوەو لەپریاری خۆم پاشگەز نیم، **سوڵتان گوتی:** زۆر باشەدوێنێ کاری تۆ ماسی گرتن بوو و من یارمەتیم دای، ئەورۆش من هێندێکم کار هەیەکە دەبێ تۆ یارمەتیم بدەی، خۆلەبەرت گران نییە، ها ؟

**مناڵەکەگوتی:** وەڵڵا هی پریارەو داومە، ئەورۆش بتەوێ یا نەتەوێ شەریکتم، بەڵام دوێنی بەختی تۆیاری دام و سفرەی ماڵی ئێمەی پرکرد، دەترسم ئەورۆ چارەڕەشی من کار لەدام و دەزگای تۆ بکا.

**سوڵتان گوتی:** ناگیانەکەمر، شانس مانایەکی نییە، جیاوازی ئێمەلەکار وفکری ئێمەدایە، ئەگەر من وەک تۆ بەتۆڕێکی بچوک لەقەراغ دەریا ماسیم گرتبا هیچم بۆ نەدەگیرا، تۆش ئەگەر لەجیاتی ئەوکارە خووت بەکارێکی دیکەگرتبا، شارەزاییت دەو کاردا پەیدا دەکرد، چاو لێکە ئەوانەی دانیشتوون دۆستانی منن، مەگەر هۆوە ڕەش نییە؟ هۆوەیان چاو لێکە، دەساڵ لەمەوبەر یەخسیرێکی مەیدانی شەڕ بوو، ئەورۆ میر لەشکرە، بابی خۆم غوڵامی یەکێک لەئەمیران بوو، ئینسان دەهەر

ڕێیەک کەوێ، دەو ڕێیەدا بەگوێرەی توانایی و لێهاتوویی و ڕەنجی خۆی پێشکەوتی دەبێ.

با لەو قسانەگەڕێین ئێمە قەرارمان داناوە ئەوڕۆش شەریکین، بەڵام کارەکانی ئەوڕۆمان لەماسی گرتن گرینگترەو دەبێ پێکەوە ئەنجامیان دەین.

**مناڵەکەگوتی:** قسەکەت حیسابییە، ئێستا بڵی من دەبێ چکارێکی بکەم؟

**مەحمودگوتی:** هیچ، لێرەدادەنیشین، هەرکاروگیروگرفتێک هاتەگۆڕێ پێکەوە لەبارەیدا دەدوێین و فەرمانی پێویستی بۆ دەدەین.

**مناڵەکەگوتی:** کەوابێ ئەوڕۆ هیچ کارێک بێ ئیزن و ئیجازەی من سەر ناگرێ قەول و قەراری ئێمە ئاوایە، بەو قسەیە هەموو ئەوانەی دەمەجلیسەکەدا بوون پێکەنین و یەکێک لەنزیکانی سوڵتان بەسرتە بەسوڵتانی گوت: قوربان ئەو مناڵە شیاوی ئەو هەموو ڕوودانە نییە دەترسم ببێتە ئەسبابی زەحمەتتان و بەر دەستمان بگرێ.

**سوڵتان گوتی:** ئەسبابی زەحمەتی چی؟بەڵێنیم پێداوە، بێت و لەژێر وەعدو قەراری خۆم بدەم بەدناو دەبم.

ئەو ڕۆژە هەر تێگیراوییەک کەپێش هات، وەک هاوفکرێکی حیسابی پرس و ڕای پێکرا، بۆ نموونە ئەو ڕۆژە سوڵتان مڵکێکی گەورەی کڕیبوو، دەیەویست مزگەوتێکی لێ سازکا، بەڵام پیرێژنێک لەقولینچکی ئەومڵکەبەرگری ئەنجامدرانی فکری سوڵتان بوو، پاش وتووێژێکی زۆر، **مناڵەکەگوتی:** وادیارە پیرێژن بەهیچ قیمەتێک ئامادە نییەماڵەکەی بفرۆشێ، وابزانم پێی خۆشەدەسازکردنی ئەم مزگەوتەدا بەشدار بێ و نێوێک لەخۆی بێڵێتەوە.

سوڵتان گوتی: ئەگەر پیرێژن ڕازی بێ قسەیەکم نییە. پیرێژن کەدەتگوت لەباتی ئەو قسەکراوە، زۆری پێ خۆش بوو، بەوجۆرە **سوڵتان دەستوری دا:** جگەلەوەی کەپارەی پێویستی بۆ کڕینەوەی ماڵێکی تازە دەدەنێ هەرکات مزگەوتەکە دروست کرا، بەری لای ماڵی پیرێژن بەمزگەوتی پیرێژن نێودێر بکرێ.

**لەپاشان هەواڵیان هێنا:** ئەمیری خۆرئاوسان یاغی بووەو داوای پاشایەتی دەکا و لەشکر و جەماوەرێکی زۆری سازداوەو دەیەوێ هێرش بێنێتەسەر غەزنە.

**سوڵتان گوتی:** ئێستا دەبێ ئەوەی جێ بەجێ بکەین.

**مناڵەکەگوتی:** چۆنت پێ باشەوادەکەین: بەڕاستی کارێکی زۆر باشت هەیە بەڵام هەتا بڵێی دەردەسەری زۆرە، ئەگەر بەمن بێ ناهێڵم شەڕو ئاژاوەساز بێ، چونکی هەر ئاژاوەیەک وێرانی بەدوادایە.

**سوڵتان گوتی:** جاری وایەبەرگری لە ئاژاوە زۆر زەحمەتە، ئەگەر هات و دوژمن و نەیار قسەی ناحیسابی کرد و تەماحی پڕ نەبۆوەو گوتی: ئی خۆشم هەر ئی خۆمەو ئی تۆش هەر ئی خۆمە، رێگایەک جگە لەشەڕو کێشە نامێنێتەوە، دوور نەڕۆین، دوێنێ ئەگەر ماسێکانمان یەک یەک لەخۆمان بەش کردبا و من سێ چوار دانەم لەتۆ زیاتر هەڵگرتبا تۆ ڕازی دەبووی؟

گوتی: بەڵێ؟

**سوڵتان گوتی:** ئەی ئەگەر ویستبام هەمووم بۆ خۆم هەڵگرتباوهیچ بەشم نەدابای ئەوکات چۆن دەبوو؟

**گوتی:** نا ئیدی، با سوڵتانیش بای لێم قبوڵ نەدەکردی.

**سوڵتان گوتی:** ئەوەش هەر ئەوەیە، وەختایەک قسەلە زۆرە ملی و کەڵەگایەتی بێ ئینسان ناچارە دەبێ دەبەرامبەریدا ڕاوەستێ.

**مناڵەکەگوتی:** ئەی ناکرێ وەک ماسێکانی دوێنێ چاوپۆشی لەخۆرئاوسانێ بکەین و بیدەینێ و پێش بەو شەڕ و هەرایەبگرین؟

**سوڵتان گوتی:** ئەوەی تۆدەیڵێی سەرناگرێ، ئەوکابرایەکەهێشتا خۆرئاوسانی نییە تەماحی پڕ نەبۆتەوە و داوای غەزنەی دەکا، ئەگەر هات و بەقسەی تۆ واشـمان کرد ئەوکات یەکێ بەلخی دەوێ، ئەوی دی داوای عێراقێ دەکا، یەکی دی تەوەرستان، ئەو وەختی ئاژاوە و بێ سەرە و بەرێتی دەوڵات دەکەوێ وکەس خەتی کەس ناخوێنێتەوە، ئەوکاتەیەکەدەبێ بپرسین کەئەدی سوڵتان مەحموود دەو نێوەدا چکارەیە؟

**مناڵەکەگوتی:** هەر تۆ نا، ئەی دەبێ بەمن چبڵێن؟!

دانیشتوان تێکڕاپێکەنین *(دیێت ؟ هێشتا هیچ کارەنی وتاقە ڕۆژێکە شەریکی منی چەندەت ئەو مەسەلەپێ ناخۆشە) ؟*

**مناڵەکەگوتی:** نا، وادیارە مەبەستەکەزۆر لەو قسانەگرینگترە، بیرم بڕناکا، وا باشەئەمیری خۆرئاوسانێ بگرین و لەداری دەین.

**سوڵتان گوتی:** نا نا شەریک گیان زۆر توند دەڕۆی، خۆ ئەمیری خۆرئاوسانێ دەست و پێ بەستەدەو مەجلیسەدا نییە، تاکو ئێمە ئاوا سوک و هاسان بیگرین و لەداری دەین، ئەوکابرایە کەتوانیویەتی داوایەکی ئاوا گەورە بکا، وادیارە دەخۆی ڕادیوەو دار و دەستەیەکی هەیە، ئێمە دەبێ بەر لە هەموو شتێ بزانین ئەو کابرایە چۆناوچۆن توانیویەتی ئەو خەڵکە لەخۆی بهاڵێنێ.

ئایا پیاوچاک و لێزان و لێهاتوو و هەژار پەروەرە یا زمان لوس و فێڵەبازە؟ کاتێ دەخووخدەی گەیشتین دەبێ بزانین ئەو خەڵکەچ کەم و کەسرییەکیان هەیەو ئەو کابرایە چ وەعدەیەکی پێداون، جا ئەوکات چارەیەک بۆ ئەو کەم وکوریانە بدۆزینەوە و ئەو وەعدانەی ئەو ئەمیرە بە خەڵکی داوە لەجیاتی ئەو بۆ خۆمان بەجێیان بێنین، ئەو دەم خەڵک لەدەوری بڵاوەی دەکەن و ئەمیری خۆرئاوسانێ تەنیا دەمێنێتەوە، دەیگرین، ئەگەر وازی لەسەر بزێوی هێنا ئەوەلێی خۆش دەبین، دەنا چۆنی بەدروستمان زانی لەکۆڵ خۆمانی دەکەینەوە.

**منالەکەگوتی:** بەڕاستی فەرمایشەکەت بەجێیە، جاری وایە لێبوردنێک بەهەزار کوشتنان هەیە.

حیسابی ئەوکارانە بەڕاستی گرینگ و سەختە،وەک ماسی گرتنێ نییە پێاو بەتەنیایی سەرەدەری لێ ناکاو لە وانەیە توشی هەڵەو خەتای گەورەبێ، چاکە شکور من ئەورۆ بۆ بیرکردنەوە شەریکێکم هەیە دەنا بەسەری خۆم توشی هەڵەی زۆرگەورە دەبووم. سوڵتان و دەست و پێوەندان تێکرا پێکەنین و تێگەیشتن کەمناڵێکی بەهۆش و لاگری عەداڵەتە.

ئەو رۆژە زۆر کاری دیکەجێ بەجێ کرا، بەڵام هەرکەبوو بەدەمی تاو پەڕان، هەستا سەرپێ وگوتی: شەریک گیان لێم ببورە، ئیدی ئەوە وردە وردە وڵات تاریک دەبێ، ئەگەر بەشەریکایەتیم ڕازی ئەوەی بزانی باشەکەهیچ رۆژێک لەوەندەی زیاتر کارناکەم، ئێستا دەزانم دایک و خوشک و براکانم چاوەڕێن. سوڵتان بزەیەکی هاتێ و گوتی: زۆر باشە ئەورۆ و دوێنێ من و تۆ شەریک بوین، بەڵام کاری ئەورۆمان لەگەڵ دوێنێ تەوفیری زۆر بو، دەزانم زۆر ماندوو بووی، داوا بکە هەرچەندی بتەوێ لەخەزێنەی من دەئیختیارت دەندرێ، جوان تێبگە، هەرچەندی بتەوێ.

**مناڵەکەگوتی:** ئیدی قەرارەکەمان تێک مەدە، دوێنێ تۆ تەنانەت دوو ماسیت هەڵنەگرت، جاچۆن من ئەورۆ شتی لەتۆ وەردەگرم وقەراری نێو خۆمان تێک دەدەم ؟

سوڵتان دیسان زەردەیەک هاتە سەر لێوی وگوتی: نانا قەرار تێک ناچێ، دوێنێ تەقە دوو سەعاتمان کار کرد، بەڵام ئەورۆ بەپێچەوانە لەئەوەڵی بەیانێوە هەدامان نەداوە دەبێ حیسابی ئەوەش بکەی.

**مناڵەکەگوتی:** جا کەوای لێهات بەنێوی ***(زیادەکاری)*** بەئەندازەی تۆرەکەم ماسیم بدەیە، لەباتیان سبەینێ لەماڵی وەدەر ناکەوم و تەواو دەحەسێمەوە. دەست و برد فەرمان درا لە ماوەیەکی زۆر کورتدا تۆرەکەیان بۆ پرکرد لەماسی.

ئینجا ڕووی دەسوڵتان کرد وگوتی: سبەینێ ڕۆژی پشوودانە، بەڵام لەدوو سبەی ڕا ڕۆژی کارو تێکۆشانە، ئەگەر شەریکایەتی منت پێخۆش بوو، دەتوانی بێێ و لەجێی گۆڕین بمبینێوە.

**مەحمود گوتی:** بۆخۆت دەبینی چەندەم کار هەیە بەڵام ئەگەر تۆ بە شەریکایەتی من رازی جارو بار وەرە و سەرێکمان لێ هەڵێنە.

**مناڵەکەگوتی:** نا شەریک گیان دڵی من بەلای دەریایەوەیە، شەریکیشم هەر بۆکاری دەریایە دەوێ، خۆ تۆش ناکرێ ئەو هەموو کارانە بەجێ بێڵی، ناوەڵڵا لەمەو بەدوا ئیدی شەریکایەتیت ناکەم.

**مەحمودگوتی:** دەزۆر باشە، برۆ، بەڵام هەرکات تێگیراوبیەکت بوو، وەرە ئێمە لێرەین. مناڵەکەگوتی: بەرقەرار بی، ئەگەر هەموو رۆژێ تۆرەکەم وەک دوێنێ پر لەماسی بێ، قەتم تێگیراوی نابێ، کاری خۆم خۆش دەوێ، ئێستا فێر بووم چۆن ماسی بگرم، دەبێ لە دەریا نەترسم و لێی بچمەپێش.مناڵەکە ماڵاوایی لەسوڵتان کرد و بەدڵێکی خۆشەوە ماسییەکانی بردەوە ماڵ و ئیتر هەرگیز بۆ لای شەریکەکەی نەگەڕاوە.

سوڵتان کەدەگەڵ خەڵکی ئاسایی هاونشین نەبوو، هەموو جارکە لەچاپلوسی و خوڵتەو زمانلووسی ئەمیران وکاربەدەستەکان جاڕز دەبوو، ڕووی تێدەکردن و دەیپرسی: هیچ کامتان شەریکەکەی ئەو رۆژەی منوو لەبیرە؟

تێکڕا دەیانگوت بەڵی..

**سوڵتان دەیگوت:** پیاوەتی و هیممەت و غیرەتی ئەو لەتەواوەتی ئێوەو ئێمە زیاتر بوو.

# گۆزەی شکاو

عەلی منداڵێکی سیس ولەڕولاواز و خێر لەدنیا نەدیتوو بوو هێشتا تەواو فامی نەکردبۆوەو دەستی ڕاست وچەپی خۆی نەناسیبوو بەهۆی نەخۆشییەکی کوت وپڕ دایکی مرد وباوکی لەبەرئەوەی هێشتا زۆری لەتەمەنی تێنەپەڕیبوو و بێ کابان مابۆوە ولەلایەکی دیکەشەوە قسەی دەوروبەریان شوینیان لەسەردانا و ژنێکی دیکەی هێناوە،بەڵام ئەوژنە کەدەبوو بە باوەژنی عەلی، زۆر کەم فام و بەرچاوتەنگ بوو وهەرچی دەیکرد نەیدەتوانێ ببینێ کەمێردەکەی کەسێکی دیکەی جگە لەو خۆش دەوێ، بەهەر شێوەیەک بۆی کرابا عەلی ئازار دەداو ڕوی خۆشی بەنیشان نەدەدا، ئاخری ڕۆژێک وەگیان هات و ڕوی دەمێردەکەی کردوگوتی: دەتەوێ تاکەنگێ ئەوڕۆستەمەی دەماڵدا ڕاگری و وەک پەروار دایبەستی؟ ڕەفیق وهاوتەمەنانی ئەوکوڕەی تۆ لەجێیان ماڵێک بەخێو دەکەن، باوک گوتی: ئافرەت ئینسافت بێ ئەوبێچارەیە ڕۆستەم لەکوێ بوو خۆ بەخوای ئەگەر بایەکی بەقەوەتی بێ دەیبا، باوەژن گوتی: من لەوقسانە حاڵی نیم بۆهەرکوێی دەبەی ببیە ولەبەر چاوی من لاییە، باوکی بێچارە هیچ عیلاجی نەما دەستی عەلی گرت و لەماڵ بردێ دەر، دەنێو شاردا تەنیا ناسیاوێکی هەبوو تێی ڕابیینێ ئەویش پیشەی ئاسنگەری بوو، بەدڵتەنگی عەلی بردەلایوو لەحاڵ وچۆنیەتی ژیانی خۆیوو ئەو منداڵە ئاگاداری کرد، ئاسنگەر کەمێک چوو دەفکرەوە ئینجا گوتی: شێتیش دەزانێ کە ئەوکوڕەی تۆ بۆکاری ئاسنگەری نابێ بەڵام قەیدێ ناکا من لەپەسیوی دوکان جییەکی بۆدیاری دەکەم با شەوانە لەوێ بخەوێ، ڕۆژانەش کە لەخەوهەستا نان وپێخۆری دەدەمێ ، ئەویش ئەوەتا گۆزە دەستی بداتێ بچێتە سەرچاوە ئاوێ بێنێ وپێش دەرکی دوکان ئاوپرژێن کاو ئەگەریش مشتەرێکان تینوو بوون ئاویان بۆبێنێ منیش جگە لە نان وپێخۆر ڕۆژانە بۆ ئەوەی دڵی بەکارەکەیەوە بنوسێ دووقڕانی حەقدەست دەدەمێ، باوکی زۆری پێ خۆش بوو

سپاسی لێکردو عەلی داماوی لە لای ئاسنگەر بەجێهێشت و بۆخۆی ڕۆیشتەوەماڵ.

عەلی بۆماوەی دەپازدەڕۆژان وەک تازە لەدایکی خۆی بووبێ وابوو، کەس لەسەری نەیدەبۆڵاند وکەس توک ودوعای لێ نەدەکرد، بەڵام خۆشی وناخۆشی ئەودنیایە هەمیشە تاسەر نییە و دەجێیەکدا کە ئینسان چاوەڕوانی ناکا گۆرانکاری دەژیانیدا پێک دێ ، ڕۆژێک عەلی گۆزەی دەست دایە ڕۆیشتە سەر چاوە، پری کرد لەئاو و بەرەو دوکان گەڕاوە، بەڵام هێشتا چەند هەنگاوێکی هەڵنەهێنابۆوە سەرەنگرێ یەکی داو گۆزەکەی لێ بەعەرز داکەوت و شکا.

بەجارێ وەک دنیایان بەتۆقی سە ری دادابێ وای لێهات، لەترسی جنێو و لێدانی وەستای ئاسنگەر لەپەنا لەتکە سواڵەتەکان دانیشت و وەک برامردوو ملی نا لەشین و گریان. پیرە پیاوێک گەیشتێ، دەستێکی بەسەری دا هێنا وشایی یەکی دەمستی نا عەلی هەروا بەگریانەوە گوتی: مامەگیان خۆ من سواڵکەر نیم، گۆزەی وەستاکەم شکاندووە لە ترسانی نازانم چبکەم؟

**پیرەگوتی:** ڕۆڵەگیان گۆزە بەشایی یەکە، یرۆ بیکڕەوە و بۆی بەرەوە، لە خۆرامەگری.

پیرەرۆیشت ، عەلی خەریک بوو هەستێ و وەدوای کڕینی گۆزە بکەوێ پیرێژنێک گەیشتێ و ئەویش شایی یەکی دەمستی ناو دڵخۆشی داوە وگوتی: مەگری مەگری، ڕۆڵەگیان، یرۆ بیکڕەوە، ئێستا پوڵی کڕینی دوو گۆزانی هەبوو، خەریک بوو هەستێ سەر لەنوێ هەرکەس بەلایدا تێپەڕی پووڵێکی دەکۆشی هاویشت و دڵخۆشی داوە، کەوتە فکر وخەیاڵ؛ لەبەری بەیانێوە شان و پیل دەکوتم و بەردەستی وەستای دەکەم و دەیان قسە و دەستوری وەستای ئاسنگەر دەبیسم بەوهەموو زەحمەتە تەقە دووقڕانم دەڕۆژ دا وەگیر دەکەوێ،کەچی هێشتا نیو سەعات نابێ لێرە دانیشتووم و دەگریم دەسکەوتم لەبیست قڕانیش تێپەڕیوە!

دەوکاتە ىدا ژنێکی خێرخواز زگی پێی سوتا و ڕۆیشتەوە ماڵ وگۆزەیەکی لەوێنەی گۆزەی خۆی بۆهێنا وگوتی: هەستە ڕۆڵە، چیدی بەخۆرایی مەبارێنە هەستەیرۆ پری کە لە ئاوو بگەڕێوەدوکان.

سەرلەنوێ گریا وگوتی: ئاخر چۆن بچمەوە؟ زۆر وەدرەنگێ کەوتوم. گوتی: هەستە، قەیدێ ناکا، دەگەڵت دێم وەستات بۆ حاڵی دەکەم، هەر ئەوکات ڕەگەڵی کەوت و هاتەلای ئاسنگەر و داوای لێکرد لێی ببوورێ.

وەستا بەڵێنی دا هیچی پێ نەڵێت، بەڵام هەرکەژنەکەرۆیشت، وەستا هەرچی حەق و حیساب بوو، لەگەڵ عەلی پاکی کردو گوتی: ها رۆڵە ئیدی پێویست ناکا سبەینێ بێیەوە ئێرە، تۆ تازەبۆ ئەوەنابی لای من کار بکەی.

تۆ ئەگەر غیرەتت بایە، هەرکەگۆزەکەت دەشکا، یەکراست دەگەڕایەوە و ئاگادارت دەکردم، زۆر زۆر خراپ بایەم حەق دەستی ئەورۆم نەدەدایەی، ئیدی پێویست نەبوو بگری و بیارێنی هەتا خەڵک زگیان پێت بسوتێ و ژنێک بەخێرا خۆی گۆزەیەکت بداتێ.

لاڵانەوە کەڵکی نەبوو بەو چەشنەکارەکەی لەدەست دا، فکری کردەوە ئەو ژنەچاکەی لەگەڵم کرد. وا باشە لەتکە سواڵەتەکان لەبەر دەرکی ماڵی ئەو هەڵوێژێرم.

گەڕاوە سەر لەت وکوتەکان و کۆی کردنەوە و بردنێ کۆڵانێک ئەولاتر، لەپاڵیان دانیشت و لەترسی زمانی زڕ دایکی هەرچی کردی نەیوێرا بچێتەوە ماڵ و بڵی: لەسەرکار دەرکراوم.

تەنانەت بەسواڵەت و لەت و کوتە شکاوەکان چلدانەشی گرتەوە، بچێتەوە؟ نەچێتەوە؟ بەڵام چلدانەش چاکی نەهێنا، ناچار بوو هەروا لەدەرێ بمێنێتەوە لە تاوان سەر لەنوێ فرمێسکی باراندەوە، بەڵام هێشتا تەواوگریانەکەی دەر نەپڕیبوو، پیاوێکی ڕێبوار پوڵێکی دەمستی ناو دڵخۆشی داوە.

نەخێر، وادیار بوو کاری تازەی زۆر لەکاری پێشوی بەقازانجتر و دەسکەوتی پتر بوو. لەمەو دوا ئەو لەتکە سواڵەتانەی کردە دەسمایەی ژیان و هەر رۆژەی لەکۆڵانێک لە عەرزی دەدان و لەسەریان دەگریا و پارەی پێ پەیدا دەکردن. تا ئەو مەسەلەیە کۆن بوو ڕێ و شوێنی سواڵێ جوان فێر بوو، هەر ڕۆژەی خۆی بە ڕواڵەتێک دەر دێنا، رۆژێک شەل و ڕۆژێک گێرو ڕۆژێک گۆج، دەنا لێر و لەوێ فێی دێناخۆی و خۆی دەخۆڵ وەردەدا و هەزار عۆینی دەگێرا.

دەوەندەی گەیشتبووکەتا شپرێوتر بێ خەڵک زۆرتر دڵیان پێی دەسوتێ و زیاتری وەگیر دەکەوێ.

ئەوەکورتەی ژیانی ڕابوردوی بوو، ئێستا ناوەکەشی گۆڕابوو وهەموو بەعەلی سواڵکەریان دەناسی، هەرچەند تەواو گەورە ببوو بەڵام وازی لەو کارە نەدێنا.

وردەوردە عەلی ئیشتیای سەفەری هەستا، لەودێ بۆ ئەودێ لەو شار بۆئەو شار، تاوەکو رۆژێک رێی کەوتەشاری نەیشابور، کەگەیشتە بەر دەروازەی شار، دەرکەوان دەنگیدا:کورەکێی؟ چکارەی؟ لەچی دەگەڕێی؟ چەندەت پارەپێیە؟

جوابی داوە: هیچ کارەنیم، نێوم عەلی نەدارە، دەستەنگ و چارەرەشـم، لە ئەبەرقویە ڕا دێم، پارەیەکی کەمم پێیە.

**پرسی:** هیچ کارێکی دەزانی؟

**کوتی:** کار؟ تەنیا هێندێک دە ئاسنگەرێ دەگەم.

**دەرکەوان گوتی:** کەوابێ دەتوانی بێیەژور، بەڵام وشیاربە لەو شارەدەست بۆکەس پان نەکەیەوە، چونکێ خەڵکی ئەوشارە پێیان خۆش نییە چاویان بە جەماعەتی سواڵکەر بکەوێ. عەلی گوتی: زۆر باشە، بەڵام باوەڕی بەقسەی دەرکەوان نەکرد، هەرکەگەیشتە دەرکەی نانەواخانە، دەستی پان کردەوەو پاڕاوە: خوا بەرکەت باوێتە عومر و ماڵت، لەتەنانێکی بدە بە منی غەریب و برسی.

**نانەواچی گوتی:** خوا بەرکەت باوێتە عومر و ماڵی خۆت، ئەو دوعایە لەجیاتی دوعاکەت، بەڵام بەڕاستی وادیارە غەریبی و ئاگات لەوەنیەکەلەو شارەسواڵکردن قەدەغەیە؟!

عەلی گوتی قەدەغەیانی چی؟ ئەی وەختایەک کەسێ برسی بێ دەبێ چبکا؟

**نانەواچی گوتی:** ئەگەر کەسێک برسی بێ و بەڕاستی هیچی پێ نەبێ دەچێتە چێشتخانەی گەڕەکێ و ژەمەنان و پێخۆری دەدەنێ. عەلی نیشانەی چێشتخانەی وەرگرت وچوو وەژوورکەوت و داوای نان و پێخۆری کرد.

مەعموران باش پشکنیان و پووڵەکانیان دیتەوە، ئینجا گوتیان: دەڵێی هیچم نییەو نان و پێخۆری خۆراییت دەوێ؟ ئەی ئەو پوڵانە ئی کێن؟ یرۆ ئەو پوڵانەت خەرج کە، هەرکات نەتما شوکور لەشت ساغەیرۆ

مل دەبەر ملی کارێک بنێ و بژیوی خۆت پەیدا کە، چێشتخانە تایبەتی کەسانێکەکەتەنانەت پوڵی ژەمە نانە ڕەقەکەشیان نیە.

**عەلی گوتی:** بەڵکوو کابرا نەخۆش بێ و توانایی کارکردنی نەبێ؟

**گوتیان:** ئەوکات دەچێ بۆ نەخۆشخانەی شار و تا چاک دەبێتەوە لەوێ دەبێ، کەهات و چاکیش نەبۆوە دەیبەنە نەدارخانەو لەوێ سەرپەرەستی دەکەن و هەتا ئەو سەعاتەی دەژی ناهێڵن لەسەر هیچ شتێک پەکی بکەوێ.

**عەلی مات بوو گوتی:** ئەوانە قسەن، دەڕۆم سواڵێ دەکەم، چەند ڕۆژ بەکوچەوکۆڵانی شار داگەڕا هەرچی پێی بوو خەرجی کرد و خواردی وکەس یارمەتی نەدا و هیچی وەگیر نەکەوت. لەهەرکوێ دوعای دەکرد، پێیان دەگوت: ئەگەر دوعایان دەزانی بۆخۆتی بکە، ئێمە بۆخۆمان دوعایان دەزانین، خوا عومری خۆت درێژکا، بۆخۆت یاریدە بدا، باوک و دایکی خۆت خۆش بن.

دەڵێی شەوی هەینی یە؟ بەڵێ دەزانین هەینی یە، شەوو ڕۆژی هەینی تایبەتی کەسانێکەکەشەش ڕۆژی حەوتەکاریان کردووەو ئارەقەیان ڕشتووەو شان و پێلیان کوتاوە، تەنیا ئی تۆ نییە هەتا بەئێمەی بفرۆشی.

**لەداخان تووک و دوعای دەکرد، ئەوانیش دەیانگوت:** تووک و دوعاکردن جورە دڵ ئێشاندنێکە و جورمەو دەبێ سزا بدرێی.

**دەیگوت:** برسیم، دەیانگوت: چێشتخانە. دەیگوت: نەخۆشم، دەیانگوت نەخۆشخانە، دەیگوت بێکارم، دەیانگوت: بنکەی کار. عەلی هەر نەخشەو پیلانێکی تا ئەوکات پێی شک دەهات گێڕای بەڵام نەیتوانی شایی یەک لەو خەڵکە وەگیرخا.

ڕۆژێک لەناکاو تووشی سواڵکەرێک بوو، وەک هەموو کەس کەبەدیتنی هاوسنفی خۆی کەیفی ساز دەبێ. بەواتەی مەشهور:

**هەرسنفێ دەگەڵ سنفی خۆی کۆکە ئاواڵی گولان دەڵێن:** خدرۆکە

لەخۆشیان بوژاوەو لێی چوو پێش و لەحاڵ و گوزەرانی پرسی و گوتی: برالە ئەوە خەریکی چی؟ نەکا خەریکی سواڵ بی؟! ئەو خەڵکەی من دەیانبینم ئەگەر لەبرسان بمری پەنجە نانێکت نادەنێ.

**سواڵكەری نەیشابووری گوتی:** خەڵكی ئێرە خێری خۆیان دەدەن بەشوێنێكی تایبەت  و حاكمی شار بۆخۆی سەر پەرستی هەژاران دەكا، ئەگەر كەسێ لەخۆڕا شتێک بدا بەكەسێک و سواڵكەر پەروەری بكا، لەلایەن حاكمەوە بەتوندترین شێوەسزا دەدرێ، دەو شارەدا سواڵكەر سازكردن و پێراگەیشتن بەوان لەتاوانانی هەرەگەورەیە.

**عەلی پرسی:** كەوایەتۆ چۆن دەتوانی سواڵ بكەی؟

**نەیشابوری پێكەنی وگوتی:** ئیزنم نییە ئەوەی بڵێم، بەڵام چونكی غەریبی حاڵیت دەكەم، تا ئەگەر چوویەوە وڵاتی خۆت بتوانی بەباشی چۆنیەتی ئەو شارە بۆهاو وڵاتیانت  بگێڕێوە.

من سواڵكەر نیم، مەعموور و موفەتیشی تایبەتی حاكمم، جل و بەرگی شڕم پۆشیوە، دەگەڕێم و دەپاڕێمەوە، داوای یارمەتی دەكەم هەر ئەوەندە یەكێک زگی پێم بسوتێ و خێرێكم پێ بكا، بەپێی ئەو ئەركەی بۆم دیاری كراوە، كابرای  دەر دەست دەكەم و بەتاوانی سواڵكەر پەروەری جەریمەی قورسی لێ دەستێنم.

**عەلی گوتی:** بەڕاستی شارێكی هیچ و وێرانەیە، ئەی سەدەقە و خێر و خێرات و زەكات و بەزەو رەحمی ئەوخەڵكەچی لێدێتەوە؟ بەو حیسابەی هەركەس  دەو شارەدا بەزەو رەحمی بێ تاوانبارە؟

**نەیشابووری گوتی:** نا، پێچەوانەی قسەی تۆ، گەورەترین شت بۆ ئینسان كەسایەتییە، ئینسانێک كەدەست دەبەڕامبەر ئینسانێكی دیكەدا پان كاتەوەكەسایەتی نامێنێ، هەر بۆیە هەركەس لەو شارەكەیفی لەخێرات و چاكەو چاكەكاری بێ دەچێ دە سندووقی پێداویستییەكانی شاری داوێ، پاشان پارەی ئەو سندووقە دەژێر چاوەدێری حەوت كەیخودای خێرخوازو جێی متمانەی خەڵک خەرجی چێشتخانەو نەدارخانەو نەخۆشخانەو ئینسانانی بەڕاستی دەستەوەستان و لێقەوماو دەكرێ، ئینسانی ساغ دەبێ كار بكا. هەمووگەڕەكەكان بنكەی كاریان لێیەو كارەكانی ئەوگەڕەكانە دە ژێر چاوەدێری ئەو بنكانە لەنێو بێكاراندا بەش دەكرێن.

**عەلی ئەو رۆژە زۆری بیركردەوە، بۆ بەیانی ستڵێكی دەست دایە وگوتی:** ئەوە بیانوی چاكە، ئەگەر كەسێكی گومان لێكراو پرسی چكارەی؟ دەڵێم: ئاوكێشم، ئەگەركەسێكیش گوتی: وەرەئاوم بۆ بكێشە، خۆم لەنەخۆشی دەدەم، هەر ئەوەندە بگەمەنێو ژنان، هەر

تۆزێک بپارێمەوە و بڵێم خوا منداڵەکانتان پێ بێڵی، بەشی خۆم وەگیر دەکەوێ، ژنان رەحمیان زۆرەو دەخێرکردن دا دەستیان وەک پیاوان نالەرزێ.

بەو نیازە چوو دەکوچەیەکی بن‌بەستە وە بەڵام تەقە ژنێک بەدەرەوە نەبوو، گەیشتە ئاخری کوچە، یەک بەخۆی هاواری کرد: ئەهای کێ ئاوی دەوێ ئاو، کێ حەوزی بەتاڵ دەکا کێ؟

هێشتا سێ چوار جاری هاوار نەکردبو، پیاوێک لێی هاتە دەرو شورت و شۆی بەجنێۆان شوشت و بەگژیدا هات کەبۆچی خەوی لەخەڵک حەرام کردووە؟ بۆچی ناهێڵی خەڵک دەماڵی خۆشیاندا ئاسودەبن؟ عەلی زۆری پێ سەیر بوو ئەوە دەڵێی چی کاکە؟ من کاسپێ دەکەم و حەقی خۆمە هەرایە بکەم و مشتەری ئاگادارکەم.

**کابرا گوتی:** کاسپی ئازادە، بەڵام هەراکردن لەداب کەوتووە. هاوارکردن ئی زەمانی باپیرم بوو، ئێستا شوکری خوا بکەپیاوێکی بەگێچەڵ نیم دەنا دەمدایە دەست مەعمووران و بەتاوانی هەراکردن جەریمەیان دەکردی یا دەیانخستێ بەندیخانە.

**عەلی گوتی:** ئەدی چبکەم؟

**کابراگوتی:** ئەو کارەی تۆ ئەرکی بنکەی گەڕەکەکانە، هەروەک سپور و بەلەدێ هەر بەچەند ماڵان ئاوکێشێکیان بۆ دیاری کراوە.

بۆکاسپی دیکەش، هەر شتێکی بفرۆشی ئازادی، بەڵام بێدەنگ دایدەنێی و لە پەنای دادەنیشی هەرکەس مشتەری بێ دێ و لێت دەکڕێ و پێویستی بەو هات و هاوارە نییە، خەڵک دەیانەوێ سەرو مێشکیان ئاسودە بێ، تەنانەت شتی وەک ورکەنان کەسانێکی تایبەتی بۆ دیاری کراوە، هەر بەچەند رۆژان بەماڵاندا دەگەڕێن کۆیان دەکەنەوەو بە ئاژەڵدارەکانی دەفرۆشنەوە و پارەکان دەسندووقی پێداویستیەکانی شار دەکەن و بەو جورەبێ ئەوەی بەخۆ بزانن کارێکی خێر و گەورە ئەنجام دەدەن. هەر کەسیش غەریب و نەدار بێ رۆژی یەکەم لەچێشتخانەی تایبەت چی پێ خۆش بێ دەیخوا، شەوەکەی لەمزڵی غەریبان دەگوزەرێنێ و بۆ بەیانی خۆی بەبنکەی کار دەناسێنێ و بێکار نابێ. عەلی ئاخێکی هەڵکێشا وگوتی: فکری هەموو شتێکتان کردۆتەوە، وەختایەک خەڵک بۆخۆیان نایانەێ سواڵکەریان هەبێ، خۆناکرێ بەزۆری بەسەریاندا بسەپێنی لە پێشداش هەر خەڵک بۆ

ئەوەی خێرێکیان کردبێ و دەرونی خۆیان لەخۆیان ڕازی کردبێ منیان بەدەستی ئەنقەست کردە سواڵکەرو پلەو پایەی ئینسانییان لێ ستاندم، دەنا خۆ دەپێشدا منیش بۆخۆم بنیادەمێک بووم، بەڵام ئێستا چی؟ تەک خوا زەلیلیان کا، بۆ ئەو چاکەی لەگەڵمیان کرد.

عەلی ئیدی هیچی بۆخواردن نەمابوو، ناچار روی دەنەخۆشخانەکرد وگوتی: نەخۆشم، بەسێ چوار دوکتورو حەکیمان خستیانەبەر چاوەدێری و پاش دو سێ سەعاتان گوتیان: هەستەکاکەتۆ نەخۆش نی، تۆ ئێرەت دەگەڵ تەنبەڵخانە لێ گۆڕاوە.

عەلی هێشتا نەیدەویست شان وەبەرکاردا، بەڵام چاری نەما و بۆ بەیانی خۆی بەبنکەی کاری گەڕەک ناساند و ئەوانیش دەستەو بەجێ گەسک و خاکەندازیان دادەستی و پاک و خاوێنی چەند کۆڵانیان پێ سپارد.

پیاوانەشانی وەبەرکاردا و چەند رۆژ حیسابی کاری کرد، شەوێک لەمیوانخانە دەگەڵ دۆستێک گەرمی قسان بووگوتی: بەڕاستی نازانم چۆن سپاسی خەڵک و یاسای ئەو شارە بەجێ بێنم، ئەوان سەر لەنوێ منیان ئۆگری کارکردەوە و ئەورۆ لەمزگەوت تەواو هۆشم بەلای خواوە بوو، لەگەڵ ئەو پەیمانم بەست کەجگەلەو دەست بۆکەسی دیکەپان نەکەمەوە و لەمەودوا دەبێ ناوی عەلی سواڵکەر بنێژم و ببمە وەستا عەلییەکی تەواو.

وردەوردە عەلی بەوکارەی کە دەیکرد ئۆخژنی نەدەهاتێ و هەستی بەوەکردکەکاری گەورەتری لەدەست دێ، هەر بۆیە رۆیشتەوە بنکەی کار وگوتی: من ئاسنگەری دەزانم، زۆریان پێ خۆش بوو لەبەر ئەوەی ئاسنگەری دەو زەمانیدا زۆر دیژوار و پێویست بوو پێشوازیان لێکرد و ناردیانەکارگەی ناڵسازان و بەو جورەکەسایەتی لەدەست چووی خۆی وەدەست هێناوە.

دەو کارگەیەدا مناڵێک دەبەر دەستیدا کاری دەکرد، جارووبار دەینارد ئاوی بۆ بێنێ، هەموو جاران  ئەو قسەی دووپات دەکردەوە: رۆڵەگیان دەئاو هێناندا وشیاری گۆزەکەت بە نەشکێ، بەڵام ئەگەر هات و شکا، بۆی نارەحەت مەبە،گۆزە بە قوربانی خۆت بێ، کورە ئەگەر هات و شکا، گورج لەت وکوتەکانی دە زبڵدان باوێ و بەپەلە لێی دوور کەوە.کورە

نەکەی بەلای لەتکە سواڵەتانەوە دانیشی، ئامман توشی سواڵت دەکەن .

زۆرجاران هاوکارەکانی دەیانگوت: وەستاعەلی تۆ زۆر لەگۆزە دەدوێی، جاگۆزەش شتە هێندەی باس دەکەی؟

وەستاعەلی ئاخێکی هەڵدەکێشاودەیگووت: ئێوەنازانن، دانیشتن بەلای لەتکە سواڵەتانەوە ماڵی بنیادەم وێران دەکا و کەسایەتی بەئینسان ناهێڵی.

# مریشک و باز

رۆژێک باز ملی نا لەلۆمەو سەرکۆنەی مریشک، کەبەڕاستی تۆ پەلەوەرێکی سپڵەو پێ نەزانی. ئەو بنیادەمانە ئەو هەموو چاکەو خزمەتەت پێدەکەن، دان و ئاوت دەدەنێ، کولێن وجێ خەوت بۆ خاوێن دەکەنەوە، کاتێ کورک دەبی دەتنێنەوە تۆزێک ناساز دەبی سیر و ماستت دەدەنێ و داوو دەرمانت لەسەر دەکار دەکەن، بەکورتی هیچ خزمەتێک نەماوە بەتۆی نەکەن کەچی تۆ ئەگەرجارێک بیانەوێ بتگرن، دەبێ ئەو سەرەو سەری حەوش و حەساریان پێ بکەی و تەواو ماندویان‌کەی، پاشانیش کەگرتیانی قیرە و هەرات رێگە رۆژێک دەڕوا،گرانی و سەنگینی لەمن فێربە، ڕۆژانە دو سێ جار بەرەڵلام دەکەن، دەچمە حەوێق و تیشقی ئاسـمان، دەگەڕێم تا ماندوو دەبم پاشان بۆخۆم لور دەبم و دێمەوە خوارو راست لەسەر شان و دەستی خاوەنەکەم دەنیشمەوەو ئەو خزمەتەی پێمی کردووە لەچاوم دەرناچێ.

مریشک گوتی: راست دەکەی بەڵام کەس ئاگای لەدەردی کەس نییە، زۆر جار خاوەنەکەم دەمگرێ و دەستم لێدەکوتێ بزانێ بەهێلکەم یانا، زۆر جار بەدەردو مەرگم ڕادەگا بەڵام دڵنیام کە دە یەکێک لەوجارانە دا دەمگرێ و خەتێکی سورم بەملیدا دێنێ و ئیدی هەرگیز ئەو دنیایە نابینمەوە، ئەو قسانەی تۆ دەیانکەی حەقی خۆتە، دەنگت لەجێی گەرمەوەدێ، دەژی و هیچ چەشنەنیگەرانی یەکت نییە، گەیشتوومە ئەو تەمەنە هێشتاچاوم بەبازێکی سەرپراو و ئاوەڕوت کراو وکوڵا وو برژاو نەکەوتووە، بەڵام بڕۆ بازاڕ و سەر بدە لەماڵان چاوێک بە نێوتاوە و قابڵەمەکانیاندا بخشێنە دەبینی هەر مریشکە دەبرژێ و هەر مریشکەدەکوڵی و هەر مریشکەدەخورێ، کەوابێ کاکی باز قسەکانت لەسەر چاوم بەڵام قەت باوەڕ بەو بنیادەمە دووروویانە ناکەم.

# تەجرەبەی مار

دەرۆژگاری کۆندا پیاوێک کاری مارگرتن و دەوکارەدا زۆر لێزان و بەئەزمون ببوو. دەچوو لەبەر کونی مار تەڵەی دەناوەوکێهەخۆراکی خۆش و دڵخوازی مارە لەسەر تەڵەکەی دادەنا و لەشوێنێک خۆی مات دەکرد، تا مار بەتەماحی خواردن دەهات و بەتەڵەکەوە دەبوو شارەزایانە لێوەی دەکرد و دە تورەکەی داویشت و دەیبردەشار، مشتەری تایبەتی هەبوو، بەپارەی فرۆشتنی ئەو مارانە پێداویستێکانی ژیانی خۆیو ماڵ و منداڵی کەم تا کورتێک دابین دەکرد.

رۆژێک تووشی مارێکی زلی خۆش خەت و خاڵ بوو، کەوتە شوێنی، هەرچۆنێ بوو کونەکەی دۆزێوە، دەست و برد تەڵەو داوی لەبەرکونەکەی دانا و خۆراکێکی باش و بۆن خۆشی بۆ هاویشتە سەر.

زۆر دانیشت بەڵام مارەکەلەکونێ نەهاتەدەر، ناچار سێ چوار جار خۆراکی نێو تەڵەکەی گۆڕی، بەڵام هیچ فایدەی نەبوو. هێلانەی مار دوو کونی بوو، مار بەکونێکدا چووبوو ژوور و بەکونەکەی دیکەدا چوبووە دەر و لەبەر تاو پاپۆکەی دابوو، دەیگوت: چاوی دەرێ با هێندە چاوەڕێم بێ تا سۆمای چاوی دادێ.

بەهەڵکەوت، حەزرەتی عیسا بەوێدا رابرد،کابرای مارگر لەبەری هەستا و سڵاوی لێکرد، عیسا بزەیەکی هاتێ و جوابی سڵاوەکەی داوەو هەروا درێژەی بەڕۆینێ داوە.

تۆزێک رۆیی چاوی بەمار کەوت، ماریش رێز و ئیحترامی خۆی بەجێ هێنا و گوتی: قوربان ئاگات لێیە ئەو کابرایە چەندە گەوجە؟ سێسەت ساڵی ڕەبەق بەئەزمونەوە ژیاوم و بەشارەزایی خۆم لەسەدان مەترسی دەرباز کردووە، کەچی بەشەرێکی سی ساڵە هاتووە تەڵەو داوی لەبەر کونەکەم داناوەتەوە، پێی وایە بەو فێڵانە دەتوانێ لەهێلانەم بێنێتەدەر، باوەڕکەئەگەر ئەو گۆچانە ئەستورەی دەدەستیدا نەبا، لێی دەچوومەپێش، وەهام پێوە دەدا هە موو تووکی

سەری با بردبای و بۆ حەوت پشتیم تەنبێ دەکرد و بیری مارگرتنێم لەمێشکی دەبردە دەر.

عیسا پێکەنی وگوتی: هەرکەسەی دڵی بەشتێک خۆشە، ئەویش دڵخۆشییەکەی گرتنی تۆیە، تۆی کەدەبێ وشیاری خۆت بی پێوە نەبی، عیسا رۆیشت و ئەوکارەی کە بووی جێ بەجێی کرد و بەرێی خۆیدا گەڕاوە کەگەیشتەجێ و شوێنی مار، ماری لەوێ نەدی، بەڵام کابرا تورەکەکەی بەشانیدا دابوو خەریک بوو بەرەو شار دەچۆوە.

**عیسا لەمارگری پرسی:** دەی ئاخری چت کرد؟

**کابرا گوتی:** گرتم، ئەوەتا دەو تورەکەی دایە.

عیسا لەتورەکەکەنزیک بۆوە، مار بەکون وکەلێنە وردەکاندا چاوی لەدەرێ دەکرد.

**عیسا گوتی:** بەو هەموو شارەزایی و ئەزمونەی هەتبوو، دەداو کەوتی؟ خۆ تازەمنیش هیچم پێ ناکرێ، ناتوانم لۆمەی بکەم چونکی مارگرتن تاوان نییە.

بەڵام خۆ تۆ گێژ نەبووی، تەڵەو خۆراکت باش دەناسین!

**مار گوتی:** ئەی عیسا، من بۆنی هەموو تەڵەو ماجووم و خۆراکەکان دەناسم، بەڵام مارگر منی بە وانە نەگرت.

**عیسا پرسی:** ئەدی چۆنی گرتی؟

**مار گوتی:** بەفێڵێکی گەورەتر، بەشتێک کەوەک کاری پیاوچاکان دەچوو.

**عیسا پرسی:** مەبەستت چی یە؟

**مارگوتی:** وەختایەک مارگردڵنیا بوو فریوی تەڵەو داوو خۆراکەبۆن خۆشەکانی ناخۆم، تەڵەی لەژێر چرپی و پوشاندا شاردەوەو دەستی بەنوێژ و پاڕانەوەکرد، لەناخی دەروونەوە هاواری خوای دەکرد، وامزانی مارگر رۆیشتووە و ئەوە ئینسانێکی پاکی لەخوا ترسە، خەریکی راز و نیاز لەگەڵ خوای خۆیەتی، سڵەم لێ نەکرد ویستم لەکونەکەم بێمەدەر، بەڵام هێشتا تەواو نەهاتبوومە دەرخۆم دەنێو تەڵەو داودا ئەسیر دیت، باوەڕکە لەوەتی مارم، قەتم فێڵی وا نەدیبوو.

**عیساگوتی:** راست دەکەی،کاری ئەو دنیایە جوراو جۆرە، زۆرجار بینراوە پیاوی فێڵەباز لەحەق دوواوەو بەبەرهەمی ناحەقی خۆی

گەیشتووەو فیڵی خۆی  تێکەڵاوی نێوی خوای گەورەکردووە، ئەوە ئێمەین کەدەبێ حەق و ناحەقی لێک هەڵاوێرین.

ئێستا بڵی بزانم ئەگەر لەو مارگرەت بکڕمەوە و بەرەڵڵات کەمەوە، بەڵێنی دەدەی بەکەسەوە نەدەی؟

مار گوتی: نەخێر، ناتوانم بەڵێنی وابدەم، چونکی من مارم و کارم پێوەدانە یەکەو دوای ئەوەش ئەگەر دەدرێژەی تەمەنمدا جارێکی دیکە نەگیرێمەوە، ئاخری بۆکوێ دەچم، رۆژێک دەکونەکەی خۆمدا دەمرم.

خۆمن ناتوانم جگەلەمار شتێکی دیکەبم، چارەنووسی من یا مردنەیا ئەوەی سەر لەنوێ دەدوای یەکێکی دیکەدەکەومەوە. عیسا گوتی: مار ژەهرەکەی لەرێی ئازارگەیاندن بەخەڵک بەکار دەبات، بەڵام حەکیمی لێزان ئەو ژەهرەی تۆ دەکاتەدەرمانی دەردان، لام وایە دووهەمیان زۆر باشتر بێت.

کوردان دەڵێن: مار بەقسەی خۆش لەکونێ دێتەدەر.

# دەستی مبارەک

دەگێرنەوە دەرۆژگاری دەسەڵاتداری سوڵتان مەحموددا، رۆژێک سوڵتان مەحمود و ژمارەیەک لەدەستو پێوەندان و فەوجێک سوپا بەنێوی راو و شکار لەشار هاتنەدەر، پاشی ماوەیەک سوڵتان تەماڵی هەستاند و رکێفی لێداو وەدوای نێچیر کەوت و لەدۆستانی دور کەوتەوە، هات و هات لەگەروگایەک ئاوا بوو، چاوی بەپیرە پیاوێکی کەنەفت و دەستەوەستان کەوت، بارێکی چرپی و پوش و پەڵاش کۆ کردبۆوە بەڵام لەبەر بێ هێزیان هەرچی دەیکرد نەیدەتوانی بیخاتە سەر پشتی گوێدرێژەکەی.

سوڵتان لێی نزیک بۆوە ماندوونەبینی لێکرد و لەحاڵی پرسی، پیرە سەرنجێکی دایەو گوتی: پێم وابێ ئەگەر دابەزی و یاریدەم بدەی زۆر لەپرسینەکەت باشتر بێ، بەرواڵەت پیاوێکی وێچویو چاکەت لەدەست دێ.

سوڵتان لەئەسپەکەی دابەزی و دەحاڵێکدا کەخەریکی یارمەتی دانی بوو پرسی: هەر بەتەنیا کار دەکەی؟

**پیرەگوتی:** بەڵێ بێکەسم، ناچارم بۆ دابین‌کردنی بژیوی رۆژانەم سەرەتەقەیەکی بکەم.

**سوڵتان پرسی:** ئەی دەپێشدا، رۆژانی لەمەوبەر چۆنت بار کردووە؟

**پیرەگوتی:** رێگام بۆ کاری خۆم دیتۆتەوە، هەرچی پوش و پەڵاشی وەخڕی دەکەم، لەسەر کەندەڵانێک کۆی دەکەمەوە، پاشان شریت پێچی دەکەم و دەیکەم بەبار،گوێدرێژەکەم دەبەمەبن کەندەڵانەکەو بەئەسپایی بارەکەی داوێمە سەرپشتی، ئەورۆش هەروام کردبوو، بەڵام بەداخەوەلێرە لەو گۆڕایەی گوێدرێژەکەم سەرسـمی دا و بارەکەی کەوت، ئیدی حیسابی ئێرەم نەکردبوو، مەحموود گوتی: هەروایە، ژیانی هەموو کەس لەڕوی حیسابێکەوەیە، بەڵام جار و بار ئینسان تووشی

گرفتێکی چاوەڕوان نەکراو دێ و هەموو حیساباتەکانی لێ تێک دەچێ، پیرەکەچاوو ڕوی کرابۆوەو کاری راست هاتبوو، گوتی: هەموو روداوێک لەڕوی حیسابەوەیە، ئەوەئێمەین کەسەرەدەر لەو حیساباتانە ناکەین، چوزانی ئەو بارەهەر لەبەر ئەوەلێرە نەکەوت تاوەکو تۆ شتێکت وەگیرکەوێ، بۆ خۆت دەبێ بزانی خێری یارمەتی بەخەڵکی لێقەوماو لەڕاددەبەدەرە.

**مەحـموود گوتی:** کەوابێ بیرو باوەڕێکی باشت هەیە.

کاتێ بارەکەیان لێناوەپیرەگوتی: زۆر ماندوو ببووم، خوا هەر بۆ خۆی کارسازە، ئەگەر نەمگە یشتبایەی بەتەنیا یی هیچم پێ نە دەکرا، ماڵت ئاوەدان بێ پرۆوەدوای کاری خۆت کەوە.

مەحـموود رکێفی لێدا و بەپرتاو خۆی گەیاندەوە لەشکریان وگوتی: ئەوە پیرێک بەو رێیەدا دێ ئەو بەرەو بەری رێیەبگرن بەجورێ پیرە ناچار بێ بەرەو خێوەتی ئێمەبێ، بەو فەرمانە دەستەو بەجێ لەشکریان بڵاو بوونەوەو هەموو شوێنەکانیان گرت، تەنیا باریکە ڕێیەک مابوو کەئەویش دەگەیشتەخێوەتەکەی سوڵتان. هەر پیرەهات و دەنگیان دا و ناچاریان کرد بەو باریکە ڕێیەدا پڕوا، هەر دەهات و لەبەرەخۆیەوە دەیبۆڵاند و دەیگووت: وای لەدەست ئەو لەشکرە زاڵمەی، خۆ هەر دەوە نافکرن کەمن پیرو بێ تاقەتم و بەرگەی ئەو جورە زەحـمەتدانەی ناگرم!

بەڵام نا وادیارەمن ئەورۆ نەهاتیمە، لەلایەکی لە دەشتێکی گۆر و نەرمان گوێدرێژم سەرسـمێ دەدا و بارەکەی دەکەوێ، لەلایەکی دیکەوە ئەوانە بەو جورە رێی چونەوە ماڵیان لێ گرتووم، خوا ئاخرم وەخێر گێرێ، بەوجورە هات و هات تا گەیشتە خێوەتی سوڵتان، کاتێ چاوی بەسوڵتان کەوت تەواو شڵەژاو دەباڵ خۆیدا گوتی: واوەیلا بۆ حاڵی من، بێ ئەوەی بۆ خۆم بزانم بێگاریم بەسوڵتان مەحـموود کردووە، خوا بکا لەجیاتی حەق دەست لەسەرم نەدا زۆر باش دەبێ، بەڵام وا باشەخۆم لەگێلی دەم هەر ئەننە هو نایناسـمەوە.

**سوڵتان گوتی:** ها پیرەلێرە چدەکەی؟

**پیرەگوتی:** مەعلومە، من پیرەپیاوێکی پوشکێشم و بۆ گوزەرانی خۆم ئەو کارەی دەکەم. بەڵام ئێوە بڵێن کێن کە ئەورۆ لەمن بوونە رێگر و پێشتان بەکار و کاسپیم گرتووە؟

**سوڵتان گوتی:** تۆ پیرو لەکار کەوتووی، بۆچی ناچی لای سوڵتان و داوای یارمەتی لێ ناکەی؟

**پیرەگوتی:** هەتا ئەوەندە تاقەتەم دەبەردا بمێنێ و تا ئەو کاتەی فکرو هۆشم ئەوەندەکار بکا کەگوێدرێژەکەم پێ بار بکرێ، نەک سوڵتان منەتی کەس ناهێنمە سەرشانی خۆم، خوا شوکور بەفرۆشی ئەو پوشانەکە بەرهەمی ڕەنجی خۆمە نەمرنەژی بەڕێ دەچم.

**سوڵتان گوتی:** قیمەتی بارەکەت چەندە؟

**پیرەگوتی:** جاران یا ئەورۆ؟ رۆژان دەمبردەشار و بەسککەیەکی زێوم دەفرۆشت.

**سوڵتان گوتی:** زۆر باشەئەورۆ ئێمەمشتەرین، رەنجی چوونەشارت لەکۆڵ دەکەینەوە، هەر لێرەبە ئێمەی بفرۆشە.

**پیرەگوتی:** زۆر باشەبەڵام باری ئەورۆم دەگەڵ رۆژان فەرقی هەیەو بە قیمەتی رۆژانی رابردوو نایفرۆشم، سوڵتان گوتی: بڵی بزانم قیمەتی چەندە؟

**پیرەگوتی:** دەکیسەزێڕ.

دەورو بەریان قسەی پیرە پیاویان پێ جورێک بێ ئیحترامی بەسوڵتان بوو لێکرا لێی دەرهەڵبوون وگوتیان: پیرە، بێ تامیش ئەندازەی هەیە، قیمەتێکی بڵی کە دەعەقڵدا بگونجێ، هیچ دەزانی ئەوەی قسەت لەگەڵ دەکا سوڵتانە؟ پیرەگوتی: کەیفی خۆیەتی سوڵتانەبۆ خۆی سوڵتانە، من نانی رەنجی شانی خۆم دەخۆم و منەتی کەس هەڵناگرم، ئەو بارەش باری خۆمە، خۆ زۆریم لێ نەکردوون، پێتان گرانە لێمی مەکڕن.

**سوڵتان گوتی:** باشە هۆی گرانبوونی ئەو بارە چییە؟

**پیرەگوتی:** وەک بزانم ئێرە سەحرایەو پڕەلەپوش و پەڵاش، ئەگەر پێویستیتان بەپوش و پەڵاش بێ دەچاو تروکانێکدا بەو هەموو حەشیمەتەی دەگەڵتانە دەتوانن سەت هێندی ئەو بارەی من کۆ کەنەوە، یەکەو دوای ئەوە بەر لەوەی بگەمە ئێوە، بارەکەم لێکەوت، پیاو چاکێک گەیشتێ و ئەو بارەی لەگەڵ لێنامەوەو دەستی مبارەکی ئەو وەو بارەکەوتووە، ڕوی نەداری ڕەش بێ، دەنا ئەگەر ناچار نەبایەم ئەو بارەم بەهیچ قیمەتێک نەدەفرۆشت.

مەحموود، بزەیەکی هاتێ و فەرمانی دا دەکیسە زێڕ یان دایە.

# تەماح

لەشارێک سێ کەس زۆر بەهەژاری و نەداری ژیانیان رادەبوارد، هەرچی هەوڵیان دەدا بژیوی ژیانی ماڵ و منداڵیان بۆ دابین نەدەبوو، بەدایم لەدەست نەداری دەیانناڵاند، ئاخری رۆژێک پێکەوەدانیشتن و پر یاریان دا ماڵ و منداڵیان بەجێ بێڵن و بەسێ قوڵی پرۆنەشارێکی دیکەبەڵکو لەوێ کارێکیان وەگیر کەوێ و لەوێرا پارەی بەشی بەڕێچوون بۆ ماڵ و منداڵیان بنێرنەوە، لەسەر ئەو بریارە هاتن و دەڕێیەدا مەرجیان دا هەرچی وەگیریان کەوت لەسەرێکی دانێن و دەگەڕانەوەدا وەک برا لێکی بەش کەن و بەکورتی دەخۆشی و ناخۆشیدا پێکەوە بن، بەو جورە هاتن تا گەیشتنە شارێک.

شەو دەکاروانسەرایەکدا ڕایانبوارد و بۆ بەیانی بەشوێن کاردا گەڕان، یەکیان لای کابرایەکی کەوش درو دامەزرا، ئەوی دیکەیان تۆزە سەوادێکی بوو لای تاجرێک بوو بەمیرزا و ئەوی تریان بو بەفاعلەو ملی دەبەر ملی کرێکاری نا، رۆژانەکاریان دەکرد و شەوانە دەهاتنە وە ئەوکاروانسەرایەی یەکەم شەو لێی دابەزیبوون، وەهایان ئاگا لێک بوو وبەدەرد و مەرگی یەکترەوە بوون ئەوانەی دەکاروانسەرادا بوون وایاندەزانی ئەوانە برای لەدایک و بابی یەکترن، رۆژانی هەینی دەیانکردە(بێڵە) و کەس دەو رۆژەدا لەو شارەکاری نەدەکرد، بەڵام ئەوان لەبەر نەداری خۆیان پێیان خۆش بوو هەموو رۆژێ کاریان بایە، پیاو بچێتە شاری کوێران دەبێ دەست بەچاوی بگرێ، چاریان نەبوو ئەوانیش دەو رۆژەدا ووچانیان دەدا، جا چونکی ماڵ و جێ و رێیەکی وایان نەبوو لێی بحەسێنەوەو کاروانسەراش هێندە جێیەکی خۆش نەبوو، رۆژانی هەینی هێندێکیان خرت و پرت و خواردەمەنی دەست دەدایەو دەچوونە دەرەوەی شار و لەژێر سێبەری دارێک یا پەنا کانی و ئاوێک رایاندە بوارد و لەرۆژی شەممەڕا سەر لەنوێ ملیان دە بەر ملی کار دەناوە.

نزیک بەهەشت مانگیان کار کردبوو لەو ماوەیەدا پوڵی باشیان بۆ ماڵ و منداڵیان ناردبۆوە پەزمەندەیەکی باشیان هەبوو.

رۆژێکی هەینی لەشار هاتنەدەر،گەیشتنە سەر کانییەک دانیشتن چایان وەسەر ناو خەریکی چرپی کۆکردنەوە بوون، لەناکاو تورەکەیەکی پر لەزیری سوریان دیتەوە، هەرکام پریاندا لایەکی.

ئەو گوتی: ئی منەو ئەو گوتی: من دەپێشدا چاوم پێی کەوتووە، ئەوی دیکەگوتی: ئەگەر من نەمگوتبا بێینەسەر ئەو کانییەکوا ئەو زێرەو دەدیتەوە؟

بەکورتی ئەو تورەکە زێرە لێیان بوو بەدرۆی مەم و زین و ئەو سەفاو وەفا و خۆشەویستی یەی جارانیان نەما، پاش کێشەو هەرایەکی زۆر گوتیان: بەراستی بۆ ئێمە شورەیی یە بۆ ماڵی دنیا ئاوا تێک بەربووین و قەول و قەرارەکانی خۆمان لەبیر بردۆتەوە، زێرەکە زۆرە بەشی هەرسێکمان دەکا هەتا ئاخری عومرمان پێی دەحەسێینەوە، وا باشەدانیشین و برایانە لێکی بەش کەین.

دانیشتن تورەکەزێریان هەڵرشت و هەرکام زێرێکی زۆریان وەبەر کەوت.

یەکیان سرت و خورت کەوتە دڵی و وەسوەسە دایگرت؛ ئەگەر ئەوانەم لەگەڵ نەبان شانم لەشانی دەوڵەمەندترین کەسی ئەو شارەدەدا، بەڵام حەیف سێ کەسین، خۆ ئەگەر دوو کەسیش باین هێشتا باشتر دەبوو، دەو فکرانەدا بوو فێڵێکی شەیتانی هات دەمێشکێوە.

گوتی: برادەرینە، ئێمەهەرچۆنێکی ئەو زێرەی خورد کەینەوەئاشکرا دەبین، ئەگەریش حاکم بزانێتەوە دەمانخاتە ژێر جەزرەبەکەبۆچی بەشی ئەومان نەداوە، تازەئەگەر هەموشی بدەینێ باوەڕمان پێ ناکا کەئەوەندە بووە، وا باشە یەکێکمان بچێتە شار بەو پوڵە پەزمەندەی لەکاروانسەرا هەمانەسێ ئەسپی چاک و نان و پێخۆرێکی تەواو بەشی سەفەرمان بکڕێ، تا هەرچی زوتر لەو ناوچەیە دوور کەوینەوە، دەنا بەسەری خۆم چۆن دەزانم خوا بەحەقە، ئاوا دەزانم بێت و ئەو خەڵکە بەدەوڵەمەندیمان ببینن دەزانن بەسەر خەزێنەیا شتێکی وادا کەوتووین، چاویان پێمانەوە هەڵنایە، دەکەوینەبەر دم و زاران، هەر بۆیەدەبێ ئێمە بچینە شارێک نەماننا‌سن و نەزانن کەدەردی نەداریمان چێشتووە، لەوێ

هەركام ماڵ و حاڵێکی دادەنێین، جا پاشان دەچینەوە شاری خۆمان و ژن و منداڵەکانیشمان رادەگوێزین.

دووکەسەکەی دیکەگوتیان: هەرفکری ناگاتێ، تۆ زۆر تێگەیشتووی و دەبیری پاشە رۆژدای، ئێمەوەک تۆ ژیرو و زۆرزان نین، واباشە بۆخۆت پرۆی و چۆنت پێ خۆشەو پێت باشە وابکە.

کابرا کەدیتی نەخشەو پیلانەکەی دەیگرێ، لەخۆشیان وەخت بوو بفڕێ، بێ ماتڵ بوون بەرەو شار وەڕێکەوت، دەپێشدا رۆیشتە بازاڕ و کێهەنان و پێخۆر و تەعام و خواردەمەنی کەدۆستانی پێیان خۆش بوو کڕی و ژەهری بەهەموویان داکرد و سێ ئەسپی چاک و رەسەنیشی کڕی و سواری یەکیان بوو ئەوانی دیکەی کردنە یەخترمە و بەدوای خۆیدا ڕایکێشان.

دەرێگا دا هەزار فکری بۆ داهاتوی خۆی کردەوەو لەوەی دڵنیا بوو کە لە سبەینێ ڕا دەبێتە یەکەم دەوڵەمەندی ناوچە، ئای خودایەگیان چەندە خۆشە! هەرکە بگەمەوە لایان ئەو نەوسن و ورگنانەدەس بەخواردنێ دەکەن و یەکتە ختەبۆی دەکەون.

بەڵام من، تازەئیدی دەردی فەقیری ونەداری ناچێژم، هەتا ئاخری عومرم دە حەسێمەوە.

لەبەرەخۆیەوەقسەی دەپەڕاند، جاری وابوو لەخۆشیان پێدەکەنی.

بەڵام لەولاوە دوو کەسەکەی دیکە، دانیشتن بیریان کردەوە، هیچ دەزانی ئەو زێرە ئەگەر سێ بەش نەکرێ و دوو بەش بکرێ چەندی فەرقە؟ وەرە ڕاوەستین هەتا دێتەوە، وەختایەکی نان و پێخۆر و ئەسپەکانی هێنا، دەیکوژین، ئەو کات بەشەکەی ئەویش بۆ خۆمان هەڵدەگرین، دوای بەستنی ئەو پر یارە، کابرا بەدڵخۆشی گەیشتەوە جێ، ئەسپەکانی بەستەوە خەریک بوو نان و پێخۆرەکەش دابەزێنێ کەبەدوو قۆڵی لەپشتەوەڕا هێرشیان بردە سەری و نە یانهێشت ئاوڕ داتەوە حەیاتیان لێ بڕی، دەست و برد قوڵکە یەکیان هەڵقەند و دەوێیان هاویشت و گڵیان وەسەردا و جوان دایانپۆشی و پشوویەکی راحەتیان هاتەوە بەر، ئەوجار مابونەوە دوو شەریک و بەشکردنی زێرەکان هاسان بۆوە، نازانم بەفێڵ بوو یا بەڕاستی یەکیان گوتی: با جارێ نانێکی بخۆین و سەرخەوێک بشکێنین، ئەو کات بەشی دەکەین و خڵاسیمان دێ و هەرکام بەرێی خۆماندا دەڕۆین .

بەئیشتیاوە تێرەکەیان دابەزاند و نان و پێخۆرو میوەکانیان دەرێنا، تازە تێدەگەیشتن دۆستەکەیان چەندەباش بووە چونکی هەرچی هێنابووی بەئیشتیای وان بوو، دەتگوت دڵی خەبەری داوەکەبۆ خۆی نامێنێ و ئەو خۆراکانە دەبێ برادەرەکانی بیخۆن، خەریک بون بۆی پەشیمان بنەوە، بەڵام تازەهیچ نەدەکرا، دانیشتنە سەر خواردنێ، زۆر برسی بوون، خواردەمەنی یەکان یەک لەیەکی خۆشتر بوون، هێندیان خوارد تا چاویان لە ژێڵڵا هات، تۆزێک پاڵیان داوە، لەناکاو ژان و پێچیان کەوتە نێو زگ و سەریان دەگێژەوە هات، ڕەنگیان بەڕۆوە نەماو کەوتنە کەف هەڵخڕاندن، چاویان دەتیشکی تاو پریبوو بەڵام وردەوردە هەموو وڵات تاریک دەبوو، ویستیان هاوار بکەن بەڵام دەنگ دەگەروویاندا حاسێ بوو ژەهرەکەکاری خۆی کرد و ئەوانیش دەحاڵێکدا کە لەترسی یەکتر، هەر یەکەی سووچێکی کیسە زێرەکەیان گرتبوو، مردن و زێر و ئەسپ و دارایی، بێ خاوەن مانەوە.

*((ئەو داستانە دەنێو فولکلۆری کوردیشدا هەیە))*

# لغاوی شەیتان

شەوانە جارو بار سوڵتان مەحموود بەرگی خۆی دەگۆری و بەنێو شاردا دەگەڕا و تێدە فکری ئەگەر چاوی بەلێقە و ماوو هەناسە ساردێک کەوتبا بۆ بەیانی لە هەر رێیەکەوە بۆی کرابا یارمەتی خۆی دەگەیاندێ.

دەگەشتی یەکێک لەو شەوانەدا چاوی بەپیرە پیاوێک کەوت کەلەسەری شەوێرا هەتا بەیانی گڵی دادەبێشت و بەیانی تۆزێک وچانی دەدا هەتا مشتەرییەک پەیدا دەبوو، کاتێ گڵەکەی دەفرۆشرا سەر لە نوێ دەستی بەکار دەکردەوە، بەکورتی ماوەو مەودای حەسانەوەی نەبوو.

چەند شەوو رۆژان مەحموود بەو جورە ئەو پیاوەی خستە ژێر چاوەدێری، دیتی بە ڕاستی شەکەت و هیلاکەو بەو جورەی دەرنابا، جا بێ ئەوەی بێڵی ئەو پیاوە بزانێ گەوهەرێکی گران قیمەتی دەخۆڵەکەی بەر دمی هاویشت تا دەکاتی دابێشتندا ببینێتەوەو لەدەردی خۆی خەرج کا، کابرای خۆڵ دابێژ پاش ئەوەی هێندێکی دیکەی خۆڵ دابێشت ئەوگەوهەرە نایابەی دیتەوە، شوکری خوای بەجێ هێناو ئەو شەوە وازی لەکار هێنا و بەیانی زوو بردی بۆلای زێر ینگەر و گەوهەرفرۆشان تا بزانێ ئەوەی دیتویەتێوە قیمەتی چەندە؟

تەواوی زێرینگەرەکان گوتیان: مەگەر چاوپۆشی لەنیوەی قیمەتی ئەوگەوهەرە بکەی دەنا کڕینی دەتاقەتی سەروەتی ئێمەدا نییە، کابرا شوکری خوای بەجێ هێنا و گەوهەرەکەی هێناوە ماڵ، لەجێیەکی باش تاقەتی کرد و سەر لەنوێ دەشەوی داهاتودا کاری خۆی دەست پێکردەوە.

مەحموود کە مەعموورێکی بۆ دیاری کردبو و زانیبووی بەدرێژەی ئەو رۆژە بەدوکانی زێرینگەراندا گەڕاوە، وەختایەک شەو داهاتەوەو ئەو

کابرایەی هەروا خەریکی خۆڵ دابێشتن دیتەوە، زۆری پێ سەیر بوو گوتی: ئەرێ کابرا وەک بزانم شەوی رابردو تۆ شتێکت دەو خۆڵەدا دیتۆتەوە کە خەراجاتی شارێکەو لەخۆت و نەوەو نەتیژەکانت زیادە، بۆ واز لەو خۆڵ دابێشتنە ناهێنی و ووچانێک نادەی؟

کابرا سەرێکی هەڵێنا وگوتی: هەرکەس هەی کەیفی خۆتە، بەڵام تۆخوا حەیف نییە خۆڵێک کە ئەو هەموو قازانجەی پێگەیاندووم وا بەهاسانی دەستبەرداری بم و وازی لێ بێنم؟

مەحموود گوتی: ئەی پیرە ئەوکارەی تۆ دەیکەی نیشانەی ئەمەگناسی تۆ بەو خاکەنییە، بەڵکو تۆش وەک زۆر خەڵکی ئەو زەمانە یە لغاوی شەیتانت دەزاری دایە، ئەوەی خوا پێی داوی بەپوخت و خاوێنی نایخۆی و بەپیسی و کەنەفتی دەژی و قازانجێکت بۆ دەور و بەریانت نییە، دەمری و بۆ قرنیسێکی وەک خۆتی بەجێ دێڵی، بەشی زۆری سەروەتی ئەو دنیایە بەو جورە دەستاودەست دەکرێ بێ ئەوەی هیچ بەهرە یەکی لێ وەربگیرێ، دەنا پیرە، دڵنیا بە ئەگەر وانەبا دنیا هەژاری تێدا نەدەما.

# تازەو کۆن

هەرچی ڕۆژبوو مەشکەکەی دەس دەدایەو دەڕۆیشتە سەرچاوە پڕی دەکرد لەئاوو بە ماڵاندا دەگێرا، جام تاسێکی پێ بوو، ئەگەر تووشی ڕێبوارێکی تینوو بوبایە یا کەسێک داوای ئاوی لێکردبا، بەو جامە دەیدایە.

ڕۆژێک کەهەروەک جاران مەشکە ئاوی بەکۆڵەوە بوو تووشی ئاوکێشێکی دیکەهات، دوای تۆخۆش و من خۆش گوتی: ئەرێ دەکرێ لەو ئاوەی پێتە جامێکم بۆ تێکەی بیخۆمەوە؟

**ئاوکێشەکەگوتی:** مەگین شێت بووی؟ تۆ بۆ خۆت ئاوکێشی و ئاوت پێیە، ئەگەر تینووی لەئاوی خۆت تێکەو بخۆوە. ئاوکێشی یەک گوتی: ڕاست دەکەی بۆخۆم ئاوم پێیە، بەڵام بەسەری تۆهێندەم لەو ئاوەی خۆم خواردووە تەوە، لەپێش چاوم کەوتووە، پێم خۆشە ئاوێکی تازە بخۆمەوە، بۆخۆت دەزانی شتی تازەو نوێ تامێکی تایبەتی هەیە.

**ئاوکێشی دوو پرسی:** بۆ لەکوێرا دێیو دەچێ کوێ.

**ئاوکێشی یەک گوتی:** لەسەر چاوە ڕا دەگەڕێمەوە وئاوی خواردنەوە یە دەبیەمە ماڵی کوێخا.

**ئاوکێشی دوو گوتی:** کەوابێ دەهەڵەدای چونکی هەرشتێ لەبەر چاوت تازە بنوێنێ کەیف و تامی تایبەتی تێدا نییە، کەیف و تام دەشتێک دایەکە نەتبێ و بۆی مەحتەل بی، دڵت لە ئاوەکەت زیزنییە، تامەکەی نازانی، ڕەنگە ئەو جامەی ئاوی پێدە خۆیەوە خاوێن نەبێ، لەوانەیە برسی بی، یا وەی تەنبەڵ و تەوەزەلی و لەئاوکێشان ماندوو بووی و بیانویان دێنێوە، لەوەی دڵنیام هەرچی هەی تینوو نی، دەنا ئەو کەسەی بۆ خۆی ئاوی سەرچاوەی پێیەو لە خەڵک داوای ئاو دەکا، هەر مانای ئاو نازانێ و ئیشتیا و تینوێتی لێ گۆڕاوە.

**ئاوکێشی یەک گوتی:** ئەو قسانە چن دەیانکەی؟ دەو دنیایەدا هەموو کەس حەز لەشتی تازەو نوێ دەکا، خەڵک دەخواردنیشدا هەمیشە شتێکی یەکجور ناخۆن، ئەوەی هەموو ڕۆژ شۆرباو دەخوا جارو

بار پڵاو دەخوا ئەوەی هەموو ڕۆژیش پڵاو دەخوا جارو بار ئیشتیای شۆرباو دەکا.

**ئاوکێشی دوو گوتی:** پڵاو و شۆرباو دوو شتی لێک جیاوازن و ئەو کەسەی کەخۆراکیشی دەگۆڕێ پێویستی بەخۆراکی تازەیە، بەڵام ئاو هەر ئاوە.

ئاوی مەشکەی من لەچاو ئاوی تۆ ڕونتر یا بڵێین تەڕتر نییە، تۆ وەک ئەو ئینسانانە دەچی کە، شکیان لە خۆیانە و وە دەزانن هەرچی دە دەستی خەڵک دایە لەئی خۆیان باشترەو هەمووکات دە هەوڵی ئەوەدان بینە هاورەنگی خەڵک و لەوەی شەرم دەکەن ئەگەر بۆ خۆیان بن.

بەڵێ گۆڕینی ئاو و هەوا پێویست و خۆشە، بەڵام تازەو نوێ بەشتێک دەڵێن کە دەردێک دەرمان کا، یا ئەوەی بۆ خۆت نەتبێ.

**ئاوکێشی یەک گوتی:** دیتت؟ من داوای جامە ئاوێکم لێکردی تۆ چەندی لەسەر ڕۆیشتی.

**ئاوکێشی دوو گوتی:** من زگم پێت دەسوتێ، تۆ دەردێکت هەیە نایناسی، دەردی تۆ دەردی تینوایەتی نی یە.

تینوایەتی بنیادەم بەرەو ئاو ڕێنوێنی دەکا، بەڵام تۆ ئاوت پێیەو لە تونیان دەناڵێنی!

بڵی بزانم وەختایەک ئاوی دەجامەکەت دەکەی باسکت نایەشێ؟

**ئاوکێشی یەک گوتی:** بەرێوەڵڵا هەموو جارێ لەتاو ئێشی باسکم دەمرم و دەژیمەوە.

**ئاوکێشی دوو گوتی:** کەوابێ تینوی بەڵام توانایی ئاوکێشانت نییە، لە وەی کەپێت وایەئاوی من تازەو نوێیە، هۆیەکەی ئێش و ئازاری باسکتە، دەبێ بڕۆی چارەی ئێشی باسکت بکەی، چونکی کەسێک نەخۆش بێ، بیانو لە هەموو شتێک دەگرێ، پێی وایە دەبێ ماست ڕەش و هێلکە چوارگۆشەبێ و هەموو پێوانەکانی دنیا لەبەر چاوانی تێک دەچن.

**ئاوکێشی یەک گوتی:** ڕاست دەکەی، عەیب دەئاوەکە مدا نییە، بەڵام بۆ خۆم ماندوم، ئێستا جامە ئاوێکم دەدەیەی یانا؟

**ئاوکێشی دوو گوتی:** ئێستاکە وشیارم کردویەوە دیسانیش قسەکەت دووپات دەکە یەوە؟

مەگین بۆ خۆت نەتگوت ئەو ئاوە لەئی خۆت خۆشترە؟ تا ئێستا گلەییت لەئاوی سەرچاوە بوو، ئەو کەڕەتەش بیانوو بەمن دەگری و خەتای داوێیە ئەستۆی من، ئینسانی نەخۆش و ماندوو ئەوە پیشەیەتی، نا،کاکی خۆم قەدری ئەوەی هەتە بیزانە، ئاوی سەرچاوە هیچ تاوانێکی نییە، تۆ نە ئاوناسی و نەبۆ ئاوکێشیش دروست کراوی.

***فارسان دەڵێن:*** مریشکی دراوسێت بەلاوە قاز نەبێ، پێت وانەبێ هەرشتێک کە دەدەستی خەڵکدایە لەئی تۆ چاکترە، بۆئەوەی دڵنیات کەم ئەوەی بزانی باشە ئەو ئاوەی خۆت ئاوی سەرچاوەیە، تازە تێت کردووە و خاوێن وبێ عەیبە بە ڵام ئەو ئاوەی کە بەمنەکۆنە ئاوێکەکە لەدوێنێوە دەبنی مەشکەکەمدا ماوە تەوە.

***کوردان دەڵێن:*** گوێدرێژی خەڵکت لەچاو گوێدرێژی خۆت پێ یەستر نەبێ.

# بەختەوەری

رۆژێک ئە نەوشیرەوان دەگەڵ بزورگومێهری حەکیم و چەند کەس لەسەرکردەکانی لەشکر بۆ ڕاو لەشار هاتنە دەر، پاشی هێندێک گەڕان، لەڕاست وێرانەیەک ڕاهاتن، ئەنەوشیرەوان لەگەڵ چاوەدێرێک بەرە و ئەو وێرانەیە ڕکێفی لێدا تابزانێ لەپێشدا چبووە و بۆچی ئێستا وا چۆل و کاول کراوە؟

کەپێی دەوێرانەکەنا، لەپاش دیوارە روخاوەکانڕاگوێی لەدەنگی پیاوێک بوو دەیگوت: ئەی خوایە سفرەی دڵم لای کێ بکەمەوە و داوای چارەی دەردمی لێ بکەم؟

خوایەگیان بەقوربانت بم یەکێکت کردووە بە ئەنەوشیرەوان و یەکێکی دیکەشت کردووەتە ئەمنی چارەڕەش!

ئەنەوشیرەوان کەگوێ بیستی ناوی خۆی بوو لێی نزیک بۆوە، چاوی بە پیاوێکی لێقە وماوی هەناسە سارد کەوت، سەری وەسەر خشتێک کردبوو،گۆزە ئاوێکی لەپشت سەری دانابو و هەروا لەبەرە خۆیەوە دەیبۆڵاند.

**ئەنەوشیرەوان پرسی:** ئەوە لێرە چدەکەی؟

کابرا زۆر ترساو بە شڵە ژاوی گوتی: هیچ، خۆ من چ خەتایەکم نەکردووە، ئێرەش خۆ ئی هیچ کەس نییە، بیابانی خوایە.

**ئە نەوشیرەوان گوتی:** مەترسێ، مەبەستێکی خراپم نییە، خەرێک بووی قسەت دەکرد و شکایەتت لە یەکێک بوو، دەمەوێ بزانم کێ غەدری لێکردووی؟

**کابرا گوتی:** گلەییم لە ژیانی خۆمە، ژیان نییەسەگ مەرگی یە.

**ئەنوشیرەوان گوتی:** دەقسەکانتدا ناوی ئەنەوشیرەوانم بیست، ئایا کارێکت پێیەتی؟

**کابرا گو تی :**جا من و ئەنەوشیرەوان؟! دەتوانم چکارێکم پێی بێ؟ تەنیا بیرم لەچارەرەشی خۆم دەکردەوە و دەگەڵ چارەی ئەو هەڵم دە سەنگاند.

**ئەنەوشیرەوان گوتی:** دەی بڵێ: بزانم من دەبێ چبکەم؟

**کابرا دەباڵ خۆیدا گوتی:** رەنگە ئەوە ئەنەوشیرەوان بێ، ئەگەر ئەو بێ؟ هەلی وام بۆ هەڵناکەوێتەوە، واباشە هەرچی دەدلم دایە بیلێم، هەستا و دانیشتە سەر چۆکان و گوتی: نەکا بۆخۆت ئەنەوشیرەوان بی؟ ئەنەوشیرەوان گوتی: چۆنی حیساب دەکەی حیسابی کە، بلێ بزانم قسەی حیسابیت چییە؟

**کابرا گوتی:** قسەی حیسابی؟ تۆ ئەگەر قسەی حیسابیت زانیبا ئاوا بە زۆرە ملی فەرمانەکانی خۆت بەسەرئەوخەڵکەڕەش و ڕووت و لێقەوماوانە دا نەدەسە پاند، هەزارەها هەزار کەسی وەک من دەو وڵاتەدا ئەوەلەبرسان دەمرن، کەچی تۆ بانگەوازی عادڵیت بۆ ناوی خۆت لێداوە.

جوان گوێم بدەیە، ئەوانەی ئەو لەقەمەیان بۆ داتاشیوی تەنیا ویستویانەگاڵتەت پێ بکەن.

ئەنەوشیرەوان لەوەی کەدیتی، چاوەدێرەکەی گوێی لەو قسانەیە، زۆر تێک چوو گوتی: دەڵێم بەدادت ڕابگەن، ئەوجار بەپەلە بۆلای بزورگمێهر چوو گوتی: وەزیر، پیاوێکی سەیر دەو وێرانە یە دایە، قسەکانی لەقەدەر قالبێوەنین ڕۆ بزانە سەزای ئەو قسانەی چییە؟ بزانەکێ هانی داوە؟ دەنا سواڵکەری وا قسەی وا چوزانێ؟!

ڕۆ، بزانم چدەکەی؟ وەزیر، ئەو قسانەی ئەوکابرایە دەیانکا، ئەگەر دەدڵ و زمانی خەڵکی دیکەش دابن، واوەیلایە بە حاڵمان.

بزورگمێهر هاتە لای کابرا و گوتی: کاکی خۆم ئەو وێرانەیە ئەویش بەتاقی تەنیا بۆ ژیان لێ ڕابواردن نابێ، زۆر بەکەنەفتیم دێیە بەرچاو، تا ئێستاش بەتۆمان نەزانیوە دەنا نەماندە هێشت دەو حاڵەی دا بی، دەپێش هەموو شتێکدا دەبێ بتنێرینە نەخۆشخانە تا دەردت چارەکرێ.

**کابرا گوتی:** نەخۆشخانەی چی؟ دەردی من بەنەخۆشخانە چاری نایە، دەردی من دەستەنگی و نەداری یە.

**بزورگمێهر گوتی:** دەردی نەداریش، بەماڵی دنیا چارەدەکرێ، هەر کەسیش بۆ پەیداکردنی ماڵی دنیا، لەقەدەر توانایی خۆی هەوڵ دەدا،

مادام کەئەو هەوڵ و تەقەللایە دەگۆڕێدا نەبێ، دنیا ئاوەدان نابێ، بڵێ بزانم تۆ بۆ دابین‌کردنی پێداویستی یەکانی ژیانت چ رەنجێکت بەخۆت داوە؟

**کابرا گوتی:** چ رەنجێک!؟ جا خۆ رێگایەکتان بۆ خەڵک نەهێشتووەتەوە تا ڕەنجی تێدا بکێشین! سی دانەساڵی ڕەبەقەچوارگۆشەی ئەو وڵاتەم سەنگ و سوژن داوەگەیشتوومە هەر دەرکەیەک داخراوە، کەس بەکەسە، پیاوێکی وەک تۆ لەجیاتی ئەوەی دەفکری خەڵکدا بی تەنیا و تەنیا دەفکری دام و دەزگای خۆت دای، بڵێ بزانم، دەبێ وابێ؟

**بزورگمێهر گوتی:** ئەگەر ڕوی پرسیارت دەمن بێ؟ دەڵێم: ئەوە حەق و مافی خۆتەکە دەبێ شاد و بەختەوەرانە بژی، ئەو خەڵکەی دەیانبینی هەمویان ژێر و تێگەیشتوو یا زۆر دەوڵەمەند یا بەهێز نین، هەر کەسەی بەجورێ، بەڵام حەقی خۆیانە، دەبێ بەشێکی هەرەگرینگی ژیانیان کەئاسوودە بوون و حەسانەوەیە دابین بکرێ، تۆ بڵێ بزانم ئەو حەقەی تۆ خوراوە؟ ئەگەر خوراوەکێ خواردویەتی، بڵێ تا بۆتی بستێنمەوە.

**کابرا قاقا پێکەنی:** تێگەیشتم، تێگەیشتم، لام وایە تۆ زۆر لە ئاغاکەت فێڵە زان تری. ئێوەن ئەو مل هورەتان سواری کۆڵی ئەو جەماعەتە ڕەش و ڕوتەی کردووە و شیرەی گیانی ئەو خەڵکەی پێ هەڵدە مژن، دەنا ئەوە چییە بتوانێ زوڵم لەو هەموو خەڵکەی بکا؟ ئەوەتا دیتت تەنانەت نەیتوانی جوابی من بداتەوە، بۆ خۆی هەڵات تۆی نارد تا مرزەمم کەی.

**بزورگمێهر گوتی:** جوانی تێگەیشتووی، ئەوە هیچ نییە، خەڵک بۆ خۆیان لە  سەر خۆیان زل کردۆتەوە، بەگیانی عەزیزانم فکر و بیر و باوەڕی من لەگەڵ  ئەوانی دیکە بە ئەندازەی ئەرز و ئاسمان لێک جیاوازە، من بزورگمێهری حەکیمم و تەنیا لەبەر ئەوە دە گەڵ ئەوانەم نەهێڵم چەت دەکاری لێقەوماوێکی وەک تۆ بخەن، ئەو جار بڵێ بزانم بەشی تۆ کێ خواردوویەتی ؟

کابرا بە تەشەرەوە گوتی: ئای حەکیم، قەرز و بەشی من لە لای کەسێک و دوو کەسان نییە تا ناویان بڵێم و داوایان لێ بکەمەوە، هەمووتان حەقی منتان خواردووە، لە دەرکەوانی بارەگاڕا بگرە تا

ئەنەوشیرەوانەکەت، قەرزم لەسەر هەموو دام و دەزگاکەتانە، ئەگەر ئەو دەزگایەی ئێوە دەفکری خەڵکدا بایە، من بۆ دەو حاڵە دا دەبووم؟!

**وەزیر گوتی:** ئەو جورەی تۆ درێژدادڕی دەکەی بەهیچ کوێ ناگەین، چونکی نەمن بەتەنیایی تاقەتم بەو دەزگایە دەشکێ، نەتۆش نوێنەری خەڵکی، لەو سەحرا ویشک و بەڕەهوتە شدا هیچمان بۆ جێ بەجێ نابێ پرێکیش دەنگمان هەڵێنین ئەو قسانە بەقیمەتی گیانمان تەواو دەبێ، با باسی خۆمان بکەین بزانین چمان پێدەکرێ؟ تۆ بەنێوکەس بەقەرزدار ناناسی، بەڵام داوای حەقی خۆت دەکەی، بڵی بزانم ئەگەر دەزانی حەقی تۆ بەلای منەوەیە تا بۆتی ڕە ت کەمەوە.

**کابرا گوتی:** بێ بەڵابی، خۆ ناهێڵی پیاو قسەکانیشی بکا، تۆ هیچ شتێکت لە من نەستاندووە تا داوات لێ بکەمەوە، من تەنیا دەمەوێ ئەوەی بزانم دەو دنیا پان و بەرینەیدا کە ڕوو دەهەر لایەک دەکەی نیعمە تێکەو خوا ئافەریدەی کردووە، پێم خۆشەبزانم دەنێو ئەو نیعمە تانەدا بەشی من کامەیە؟

تۆ کەحەکیمی، خۆ دەبێ ئەوەی بزانی.

**وەزیر گوتی:** دەزانم، بەشی تۆ دەکرێ لە هەموو جێیەک بێ، بەڵام هەروەک کاتێ تینوو دەبی دەست بۆ ئاو درێژ دەکەی، بۆ هەڵگرتنی بەشی خۆشت لەژیان دەبێ بجوڵێیەوە و نەهێڵی بەشەکەت بفەوتێ، کابرا گوتی ئەگەر دەستم درێژ کەم دەڵێن دزە یا سواڵکەرە، بەداخەوە ئەوانەهیچ کامیان بەئاواتم ناگەیێنن.

**وەزیر گوتی:** مەبەستم ئەوە نییە دەست بۆ ماڵی خەڵک درێژ کەی یا لە پێشیان پانی کەیەوە، مەبەستم ئەوەیە، هەر وەک بۆ دەستدانی تونگەی ئاو زەحمەت دەکێشی تا دەیخۆیەوە، ناچاری بۆ شتەکانی دیکەی ژیانیش خۆت ماندوو کەی. لەبارەی دەزگا و حکومەتیشدا هەرچی گوتت وایە، بەڵام دێرەدا ناکرێ لە تەوەزەلی و بێ فکری تۆش چاوپۆشی بکرێ.

بۆخۆت قبوڵتەکەسی ساڵ گەڕان و سورانەوەی بەخۆڕایی بەهیچ کوێی نەگەیاندووی، تۆ ناچاری دەبێ کارێکی دیکە ڕەچاو کەی تا لەو نەداری و چارەرەشی یەی نەجاتیت بێ و چیدی لە دەست ژیان نەکڕوزێیەوە.

**کابرا گوتی:** راست دەکەی بەڵام هیچ کارێکی دیکەم پێ شک نایە.

**وەزیر گوتی:** بە پرواى من تۆ ماڵ و حاڵێک و ژن و منداڵ و جێ و بان و بەرگ و لیباس و نان و پێخۆر و رێز و ئیحترامێکت دەنێو خەڵکدا هەبێ بەستە، وایە یانا؟

**کابرا گوتی:** جا ئەگەر ئەوانەم بوایەچ شکایە تێکم لەژیان دەبوو؟

**وەزیر گوتی:** زۆر باشە، بەوەت دەڵێن قسەی حیسابی، بەڵام براکەی بابم تەواوی ئەوانەی ئەو شتانەیان هەیە بە دڵنیایی هەوڵێکیان بۆ داوە، هیچ کامیان نەهاتون بێکار و بێ بار دەوێرانەدا نەکەوتوون وشکایەتیان لەرۆژگار نەکردووە.

ئەگەر هەموو خەڵک هاتبانە سەر ڕەوشتی تۆ کاری دنیا بە جارێ پەکی دەکەوت و هیچ دەزگایەک توانایی دابین‌کردنی بژیو وگوزەرانی ئەو هەموو برسییانەی نەدە بوو، تەنانەت ئەنەوشیرەوانێکیش دەگۆڕێدا نەدەما.

**کابرا گوتی:** وایە، بەڵام من کارم وەگیر ناکەوێ، هەر یەکێک نییە بەردێکم پێ لەسەر بەردێک دانێ، جا بۆیە لە هەموو شتێک بێزار بووم، وەزیر گوتی: بەهەڵەدا چووی کار هەیە، ئایا لەبەیانی ڕا ئامادەی بێیە جێگای من و ببی بەوەزیر و منیش بڕۆم و وەدوای کارێکی دیکەبکەوم ؟

**کابرا گوتی:** نەخێر، چونکی دەزانم هونەر و شارەزایی تۆم نییەو زۆر زوو دەکەومە بەررەخنەو لۆمەی خەڵک و رۆژگارم لەوەی هەیە ڕەشتر دەکەن.

**وەزیر گوتی:** دەی زۆر باشە، ئێستا کەناتەوێ ببی بەوەزیر، ئەورۆ ئێمە لەڕاویین، ببە بەسەر ڕاو، کارێکی هاسانەو پولی چاکیشی تێدایە.

**کابرا گوتی:** نەخێر، ئەوەش فایدەی نییە، چونکی دەبارەی ڕاودا هیچ شارەزایی یەکم نییە، دەترسم توشی دەردەسەرێ بم.

**وەزیر گوتی:** دەی ئەوەش نەبوو، کارێکی دیکەشمان هەیە دەتەوێ فەرمانێک وەرگرم لەکتێبخانە داتمەزرێنم و دەگەڵ کاربەدەستانی ئەوێ خەریکی لێکۆڵینەوەبی؟

**کابرا گوتی:** نەخێر ئاغا، ئەوەش جێ بەجێ نابێ، چونکی من بێسەوادو نەخوێندەوارم، ئەوەش تاوانەکەی دەگەڕ ێتەوە سەر

ئەنەوشیرەوان، خەڵکی کردە دەستە دەستە و ئەوسا خوێندنی لەمناڵی زەحـمەتکێشان قەدەغەکرد.

ئێستا قبوڵی دەکەی کەئاو لەسەر چاوەوە قوراوە؟

**وەزیر گوتی:** راست دەکەی، عەیبی کار یەک و دوو نین، بەڵام چاوەکەم پێم وانییە سەواد وفێربوون هێندە زەحـمەت بێ، سی ساڵ ئاوارەو سەرگەردان بووی ئەگەر هەر رۆژەی پیتێک فێر بوبای بەتاقە سی رۆژان فێری خوێندن و نوسین دەبووی. دەزانی تا ئێستا چەندت دەزانی؟

خۆ ئەنەوشیرەوان غەیب زان نییەکەبزانێ تۆ خەریکی شت فێربوونی.

دەنێو خەڵکدا زۆرن کەسانێ کەجوابی دەستوری ئەویان نەداوەتەوە و بەنهێنی خوێندویانە یا خەڵکیان فێرەخوێندن کردووە،کاکی خۆم چونە ژێر باری زوڵم ئەویش بۆ خۆی زوڵمێکە، ئینسان دەبێ بۆ خۆی شتێکی بوێ، هەوڵی بۆ بدا و پێی بگا، هەر ئەو قسەی من کە ئێستا لای تۆ دەیکەم ئەگەر بەگوێی ئەنەوشیرەوان بگاتەوە سەرم بەفەتەڕات دەچێ، بەڵام هەر گرفتێک رێگا چارەیەکی هەیە، کابرای زۆردار وەختایەک بزانێ خەڵک لەژێر باری زۆری ئەودا سەریان بەرداوەتەوە و هیچ ناڵێن زیاتر درێژە بەزۆرە ملی خۆی دەدا. بەڵام وەختایەک دە بەڕامبەریدا راوەستن و دمکوتی کەنەوە، نەک ئەنەوشیرەوان، بەڵکوو حەوت پشتی ئەویش و تەنانەت کەسێکی لەویش بە دەسە ڵاتتر ناتوانێ دەبەڕامبەر ویستی یەکگرتووی خە ڵکدا ڕاوەستێ.

ئێستا ناتوانم لۆمەت بکەم، بەزویی فێرە سەوادوخوێندن دەبی، تەنیا ویستم تۆزێک وشیارت کەمەوە.

**کابرا گوتی:** من خۆم وشیارم، پێویست ناکا وشیارم کەیەوە، سەدان بێسەوادی دەناسم کە هەزاران کلوریان پارە وسەروەت هەیە.

**بزورگمێهر گوتی:** وا باشە هەموو شتێکی تێکەڵ یەک نەکەی، بەڵکو یەکێک لەرێی دزی و شڵتاغ و فێڵبازی و داوێن پیسی و زۆر کاری دیکەی ناڕە وا پارەیەکی زۆری پێکەوە نابێ، ئەوەی بەبەختەوەری نازانم.

تۆ ئەگەر سەدان کەسی دەناسی کە بەناحەق پێگە پشتوون، من دە هەزاران کەسی دەناسم کەبۆ خۆیان بەرەنج و تێکۆشان و هەوڵ و تەقەللای خۆیان بە بەختەوەری گەیشتوون.

تۆ دەتتوانی یەکێک لەو دەهەزارانە بای، بەڵام تازە رابردووە، ئێستا ئەگەر پرۆم و لە ئەنەوشیرەوان داوای هەزار کلورت بۆ بکەم پێت باشە؟

**کابرا گوتی:** جا چ لەوەی باشترە؟!

**وەزیر گوتی:** ئەسقەزا زۆر خراپە، ئەگەر هەروا بەسوک و هاسانی ئەو پوڵەت بدە نێ دوو عەیبی گەورەی تێدایە، یەک لەوانە ئەوەیەکە تۆش دەبی بە یەکێک لەو بێکارە تەمبەڵانەی کەپارەی خەڵک بەمفتێ دەخۆن و خوڵتەو چاپلوسی لە بەر ئەنەوشیرەوان دەکەن، فەرق ناکا، تۆش دەبی بە هاودەستی کەسێک کەتا ئەو کاتەی رقت لێیەتی، عەیبەکەی دیکەی ئەوەیە؛ تۆ  ئەو پارەیە خەرج دەکەی بێ ئەوەی کارێکت کردبێ و شوێنێکی باشت لەخۆت جێ هێشتبێ، بەو جورە هەموو عەیب و کەم و کورێکان لەجێ و شوێنی خۆیان دەمێننەوە.

**کابرا گوتی:** راست دەکەی، قسەکانت بۆنێکی ئاشنایان لێدێ، کار لەدڵم دەکەن، بەڵام بۆ کردنەوەی گرێ پوچکە و تێگیراوی گەورە پێویست بەهاوکاری هە مە لایەنەی خەڵک هەیە، رێگایەک بەمن نیشان دە، هە رچە ند زۆر بەو ناوە حەکیمایەتێی تۆ دڵخۆش نیم، بەڵام لام وایە دەتوانی گرێی ژیانی من بکەیەوە.

**بزورگمێهر گوتی:** ئافەرین، هەردەبێ واش بێ.

ئێستا بزانین چدەکرێ؟ ئەڵبەت لەبیرت بێ تۆزێک درەنگ وە خە بەر هاتوی  دەبوایە لەسەرەتای لاویەتیت ڕا فێری کارێک بوبای، بەڵام هێشتاش درەنگ نەبووە، ماسی هەر وەخت لەئاو بیگری تازە یە، چاو لێکە هەر ئەورۆ لەجیاتی  ئەوەی هاتوی لێرە بێکار پاڵت داوە تەوە، ئەگەر چوبای کۆڵانێکت گەسک دابا، خەڵکی ئەو گەڕەکە دە یانزانی کە لە داخ بێکاری وادەکەی، بە پیاوێکی کارکەریان دەناسی و هەوڵیان دەدا کارێکی باشتریان بۆ پەیدا دەکردی، نەکەس پێی دەگوتی شێتی، نەکە سیش بەسواڵکەری دە ناسی، وردە وردە تۆزی بەدبەختیت لە سە ر لادە چوو وەک ئەو خەڵکە ژیانێکی ئاپرودارانەت دەست پێدەکرد و لە قەدەر رەنج و تێکۆشانی خۆت بەماڵ و نەوایەک دەگە یشتی، کابرا ئەو جار بە ئیحترامەوە لەجێی خۆی هەستا و گوتی: راست دەکەی، ئێستا

تێدەگەم کەبۆ خۆم چەندەکەمتەرخەم بووم، هەر ئەمڕۆ دەڕۆم و دەس پێدەکەم، هەزار جورەکار هەیە، مەسەلێکی کۆنی کوردی هەیە دەڵێ:

پیاو لەسەر کێوێک بێ ئەگەر ئیشتیای لەکارکردن بێ دەتوانێ لەوێش کارێک بۆ خۆی پەیدا کات.

ئێستا من دەمەوێ کارێ بکەم و فێری خوێندن بم، هەر لێرە ڕا دەست پێدەکەم و بەدوایاندا دەگەڕێم، بڵێ بزانم تۆ هیچ کارێکت پێ شک دێ زوو بیگەمێ و ڕێگام بۆ نزیک بێتەوە؟

**بزورگمێهر گوتی:** وەختایەک ئینسان عەیبی خۆی ناسی و بڕیاری دا خۆی لەو عەیبە خاوێن کاتەوە، هەموو ڕێگاکان نزیک دەبنەوە.

لەبەر دەرگای دەروازەی شار، تازە دوکانێکی ئاسنگەری داندراوە، دڵنیام کارگەری دەوێ، بڕۆ ئەگەر ویستی باشە، دەنا...

**کابرا کوتی:** دەنا و مەنای ناوێ، تۆ بڕۆ جوابێک بۆ ئەو کابرایەی تۆی ناردۆتە لای من سازکە، کارت بە من نەبێ.

کابرا، کە هیچی نەدەزانی ڕۆیشتەدوکانی ئاسنگەر و دەبەر دەستی وەستا خاڵەکاندا دامەزرا، هێندە بەتامەزرۆیی سەرنجی دا دەستی وەستاکان دەماوە یەکی زۆر کورتدا بوو بە وەستایەکی قابیل و ڕۆژ بەرۆژ کارجوانتر دەبوو و حەقدەستی زیاتری وەردەگرت.

پاشی چەند ساڵ، یەکجاری بوو بەسەرپرستی دوکانەکەو هەموو کارەکان کەوتنە ژێر چاوەدێری ئەو.

ئیدی ئەوکات، ئەنەوشیرەوانێک دەدنیادا نەمابوو، بۆ یەکەمین کار بەهاوکاری خەڵک جێگایەکی دروست کرد تا دەوێدا نەخوێندەوارەکان بتوانن بەئازادی فێرە خوێندن و نوسین بن، ئەو ئێستا زۆربەی نهێنی یەکانی بەختەوەری ناسیوە.

# مێش و مێش هەنگوین

لەنێو مێرگێکدا مێشە ڕەشێک دڵخۆش و سەرخۆش خەریکی ڕابواردنی خۆی بوو، هەڵدە فڕی هەرکوێی پێ خۆش بایە دەچوو دەنیشت، فەرقی بە خاوێنی و پیسی نە دەکرد شیرەی گوڵانی هەڵدە مژی بەڵام حورمەتی سفرەی نە دە پاراست و وەک زۆر بنیادەمی سپڵە، پاش ئەوەی تێر دەبوو نەیدەگوت ئەو گوڵە سفرەیە، من لەسەر ئەوە خۆم تێر کردووە با ئەو سفرەیە بۆ ڕێبوارێکی دیکە خاوێن بمێنێتەوە، ئەگەر کاری ئاوی بایە هەر لەوێ دەیکرد و لەو ئازادی یەی هەیبوو دروستی کەڵک وەرنە دەگرت.

جارو بار بەنێو شیناوەرددا دەخولاوە و دەیگوت: ئۆخەی ژیان چەندە شیرینە،چەندە بەختەوەرم، هەرکوێم پێ خۆش بێ دەچم، هە رچیم بوێ دەیکەم، بە راستی ئازادی شتێکی خۆشە.

پاش ماوەیەک چاوی بەمێش هە نگوینێک کەوت لە سە رگوڵێک نیشتبوو و خەریکی هەوڵ و تەقەللای خۆی بوو و پوخت و خاوێن شیرەی گوڵەکانی هەڵدە مژی.

مێش بۆگاڵتە پێکردن لە سە ر پەلکی گوڵێک نیشت و گوتی: سڵاو لە هەنگی زەحمە تکێش، بڵێ بزانم کە نگێ لەو کارانەی دەیکەی ماندوو دەبی؟

مێش هەنگوین، دەستی لەکار کێشاوەو گوتی: برۆ برۆ، حەوسەلەی گاڵتەم نییە، بەردەستم مەگرە.

**مێش گوتی:** نانا، بە راستیمە، پێم خۆشە بزانم ئێوە مێش هە نگوینەکان کە دایم خەریکی ڕەنج و کوێرە وەرین و دەسکەوتەکەشتان ئەوەندە نییە دەتاریف بێ، چونکی هە رچی ئێوە ئاوا بەکوێرەوەری بەرهەمی دێنن، بنیادەمەکان دێن و بۆخۆیانی پڕ دەدەن و شتێکی وا بۆ ئێوە ناهێڵنەوە، بەڵام ئێمەکێهە چێشتی بەتام و بۆنە بێ زەحمەت و کوێرەوەری دەیگەینێ و دەیخۆین و بەئازادی ڕایدە بوێرین.

مێشهەنگوین ئەو قسانەی زۆر پێ ناخۆش بوو گوتی: بەڵێ وایە بە ڵام لەبیرت چوو ئێوەبۆ بەڕێچوون لەسەر پیسایش دەنیشن.

**مێش بەپەلەگوتی:** جاقەیدی چییە؟ ئەو پیسایانەش بۆخۆیان جورە چێشتێکن بە ڵام دووجار کوڵاون.

گرینگ ئەوەیەکەبێ ڕەنج و هەوڵ و تەقەللا وەگیرمان دەکەون، تەنانەت هەنگوین ئەو خۆراکە خۆشەکە ئێوە ئاوا بەزەحمەت سازی دەکەن، ئێمە سووک و هاسان دەیخۆین.

**مێشهەنگوین گوتی:** دروستە بنیادەمەکان لە هەنگوینی ئێمە دەخۆن، دەراستیدا ئەوان خزمەتکاری ئێمەن، پوخت و خاوێن دێن شانەکان دەبرنەوە بەشی ئێمەدەکەندوودا دێڵنەوە و رێی هاتووچۆمان بۆ کاری دووبارە بۆ دەکەنەوە، ئاخر ئێمە ئاشقەکارین، بێت و ماوەیەک وەک ئێوە بێکار و بێ بەرنامە بین دەمرین دەنا وەک دەڵێی هەنگوین خواردن ئەوەندە هاسان نییە.

**مێش بەگیزوویز قاقایەکی لێدا و گوتی:** جا چ شتێ لەهەنگوین خواردن خوشتر و هاسانترە؟

مێشهەنگوین دیتی بەقسە ناتوانێ وڵامی ئەو مێشە پیسکێر و لە خۆرازی یە بداتەوە، فکری کردەوە گوتی: هەنگوینت پێ خۆشە؟

**مێش گوتی:** لە هەنگوین شیرنتر هیچ شتێکم پێ شک نایە.

**مێشهەنگوین گوتی:** کەوایە فەرموو ئەورۆ میوانی من بە، دەچینە خەڵێفی ئێمە و تێر و پڕ هەنگوینی بخۆبە ڵام واز لەو قسانە بێنە.

مێش ئەو قسەی زۆر پێخۆش بوو، بە دڵخۆشی وەدوای مێشهەنگوین کەوت، کاتێ گەیشتنە زارکی خەڵێف، یەکجار زۆر گەورە بوو و سەدان کارگەر و چاوەدێر ئاگاداریان لێدەکرد.

**مێش کەئەوەی دیت گوتی:** خانە خوێ، ئەو چاودێرانەی من دە یانبینم قەت ئیزنی هاتنە ژوورم پێ نادەن.

**مێشهەنگوین پێکەنی و گوتی:** تۆ کارت بەو قسانە نەبێ ئەوەنییە من دەگەڵتم!

مێش بەدەستوری مێش هەنگوین لاق و لەتەری خاوێن کردەوە و وەدوای کەوت.

هەر چاوە دێرێک هاتبا پێشی پێگرتبان مێشهەنگوین سرتەیەکی لە بن گوێی دە کردو ئەوانیش رێیان پێدەدان.

مێش ئەو سرت و خورتانەی زۆر پێ سەیر بوو و پرسی: ئەرێ ئەوە چیان پێدە لێی وا بەقسەت دەکەن؟

**مێش هەنگوین پێکەنی و گوتی:** قسە یەکی سەیر ناکەم، دەڵێم: ئەو مێشە دۆستی خۆمانە لێی گەڕێن، ئاخری مێش و مێش هەنگوین چونە نیو خەڵێفەکەو لە نزیک شانەی هەنگوینەکان نیشتن.

**مێش هەنگوین گوتی:** فەرموو، تۆ کەهەنگوینت پێ خۆشەو لات وایە خواردنەکەی هاسانە، بخۆ، شەرمێ مەکە.

مێش لە بەر چڵێسسیانی ئاگای لە خۆی نە ما و بێ وڵامدانەوە رۆیشتە سەر شانەیەک نیشت ، بە ڵام هەر نیشتن و پێوە نووسانی یەک بوو، هەرچی هەوڵی دا نە یتوانی خۆی دەربازکا، هەرچی زۆرتر دەجوڵاوە زیاتر دەهەنگوینەکە دا قوم دەبوو، پاشی ماوەیەک مێش دەنێو هەنگویندا خنکا و کارەگەرەکان وێرای خواردە مەنییەکانی دیکە دەرخواردی پێچوو چکۆڵەکانیان دا.

***کوردان گوتویانە: دوژمنی خۆت بەهەنگوین بخنکێنە.***

# ئەسپەندەر

پیرێژنێکی هەژار، لە دارایی دنیا تەنیا خانوو شڕەیەکی یەکی بوو،هاوین و پایزان لە بەر بەرسورکەو هەزارپێ و مڵەو سەدان داعباوجڕوجانەوەری دیکەو بەهار و زستانان لە ترسی روخان، بۆ ئەوە نەدە بوو کەبڵێی ماڵەو جێی حەسانەوەیە.

کار و کاسبی و بەکورتی بژیوی پیرێژن لەکۆنە مقەڵییەکەوە دابین دەبوو هەرچی رۆژبوو دەهاتەکۆڵان و هێندێک ئەسپەندەری دەس دە دایە، هەرکەس بەوێدا ڕابردبا، پیرێژن هێندێکی لەو ئەسپەندەرە بۆ بەسەر مقەڵێکەدا دەکرد و دەیگوت:حەک لەچاوی پیس بە دووربی، ئەو دوکەڵە بچێ دەچاوی دوژمنانتەوە. بەم جۆرە رێبوارانیش دڵیان بەو قسانەخۆش دەبوو شتێکیان دەدایەو ئەویش کەم تاکورتێک خەرجی ژیانی خۆی پێ دابین دەکرد.

ئەو پیرێژنەو ماڵەکەی وە ها ناسراوی خەڵک بوون، هەرکات دەروو دراوسێیان ویستبایان نیشانەی ماڵی خۆیان بدەن بەکەسێک، ناچار بوون لەناو و نیشانی پیرێژن کەڵک وەرگرن و بڵێن: بە ڕامبەری ماڵی پیرێژن، یا سەت هەنگاو سەرتر یا دەهەنگاو خوارتر.

پیاوێکی دەوڵەمەند ماڵەکەی جیرانی ماڵی پیرێژن بوو، بەخۆیو ژن و منداڵێوە چەندی بۆیان کرابا یارمەتی پیرێژنیان دەدا.

هەموو شتێک ئاسایی بوو تاوەکوو رۆژێک ئەو پیاوە دەوڵەمەندە هێندێکی شت و مەکی لە بازاڕ کڕی، بانگی بارە بەرێکی کرد تا بۆی بەرێتەوەماڵ.

زۆری خۆ زەحـمەت دا تا نیشانی دروستی ماڵەکەی بدا بەکابرای بارەبەر کوچەی ژومارە فڵان، دەرکەی چوارەم، دیواری قاوەیی. دەئاخری را کابرای بارەبەر گوتی: حاڵی بووم، ماڵەکەت دیوار بەدیواری ماڵی پیرێژنێیە، دەی پیاوی چاک زوتر ئەوەت گوتبا ئیدی ئەو هەموو شێر و ڕێوی یەی نەدەویست.

کابرای بارەبەر شتەکانی بۆگەیاندەوە ماڵ، بەڵام کابرای دەوڵەمەند بەو قسەیە زۆر تێک چوو دەباڵە خۆیدا گوتی: جا وەرە توخواکەی ماڵی من بە ماڵی ئەو پیرێژنە سواڵکەرە وە دەناسن!

*راستیان گوتووە:* پیاو ناتوانێ لەنێو پۆلێک خەڵکی چارە ڕشدا هەست بە بەختەوەری بکا، تا هەموو بەختەوەر نەبن کەس ئاسودەنابێ، واباشە فکرێک بۆئەو جیرانە بکەمەوە.

**رۆیشتەلای دەڵاڵێک و گوتی:** دەمەوێ ماڵی پیرێژن وەسەر ماڵی خۆم گێرم نەزانێ کڕیار منم، بەهەر چەندێک رازی بوو بۆم بکڕە، دەسخۆشانەیەکی باشت دەدەمێ.

کابرای دەڵاڵ رۆیشتە لای پیرێژن و بەزمانی لوسی دەڵاڵانە هەواڵی بەپیرێژن دا کە مشتەریەکی چاک بۆ خانوبەرەکەی پەیدا بووە و دەتوانێ بە قیمە تێکی باش پێی بفرۆشێ.

**پیرێژن گوتی:** کارم بەوە نییە ئەو مشتەرییەکێیە، بەڵام باشەبزانی کە ئەو ماڵە یادگاری دەورانی خۆشی و جوانیمە، حازر نیم بە هیچ قیمەتێک لە دەستی بدەم.

دە ڵاڵ ئەو هەواڵەی بەکابرای دەوڵەمەند دا،کەوتە فکرەوە و زانی لەو ڕێگەیەوە بە مراد ناگا، ئەگەریش لەوە زیاتر پێداگرێ، دەنێو شاردا دەبێتە دەنگۆکەفڵانە دەوڵەمەند تەماحی دەماڵی فڵانە پیرێژن کردووە و بەوجۆرە ئابڕووی بەهەزار ساڵەم دەچێ.

**بیری کردەوە:** واباشە پیرێژنی بانگێشتن کەم ئەگەر بزانم لە ڕووی دەس تەنگێوە ئەو کارە دەکا، ئەوە بۆخۆم فکرێک بۆ حاڵ و گوزەرانی دەکەمەوە، ئەگەریش ئەو کارەی لەڕووی عادەتەوەبێ، بەجۆرێک پێی تەرک دەکەم.

بۆ نەهار خێزانی بەدوای پیرێژندا نارد، زۆری بەخێر هێناو لەحاڵ و چۆنیەتی گوزەرانی پرسی.

**پیرێژن گوتی:** ئەی لە سایەی سەری ئێوە وە، بوونی ئێوە دەوگەڕەکە دا بۆمن مایەی خێر و بەرەکە تە، مناڵەکانت زۆرم پێ ڕادەگەن خوا دەست بەعەمریان گرێ.

پاشان باسیان کێشا سەر ئەسپەندەر.

**کابرا پرسی:** ئەرێ ئەسپەندەر سوتاندن چ قازانجێکی هەیە؟

**پیرێژن گوتی:** ئەی ئاغا بێ بەڵا بی، جا چۆن ئەوەی نازانی؟ لەقەدیمەوەگوتوویانە ئەسپەندەر دەرمان و عیلاجی چاوی پیسە، جا خۆ ئەوەی هەموو کەس دەزانێ!

**کابرا پرسی:** چاوی پیس؟! دە مەبەستت ناگەم.

**پیرێژن گوتی:** مەبەست لە چاوی پیس، چاوی بەغیل و حەسوودە، وەختایەک کەسێک چاوی بەرایی نادا شتێکی جوان یا باش کە دڵخوازی خۆیەتی دەدەستی یەکێکی دیکە دا ببینێ، ئەگەر ئەو چاولێکردنەی بەچاوێکی پیسەوەبێ، لەوانەیە شتەکە، یا تەنانەت خاوەنەکەی بەڵایەکی بەسەر بێ و لەناو بچێ.

**کابرا قاقا پێکەنی و گوتی:** شتێکی نەگونجاوە، جا چۆن بەتاقە تێروانینێک ژیانی یەکێک خرا دەبێ؟ تۆ چاو لێکە خانویەک کە بەباشی، بەخشت و سمیت و گێچ دروست کرابێ بۆ روخاندنی دەبێ وە بەر تۆپان بدرێ، یا ئەوەی بەپاچ و پێمەڕە خرا بکرێ.

**پیرێژن گوتی:** مەبەستم ئەوەیە، ئەگەر چاوی پیسی وێ بکەوێ لەوانەیە ئەو ماڵە لەدەست خاوەنەکەی بچێتەدەر.

**کابرا گوتی:** شتی وا نابێ، ماڵ یا خانو وەختایەک لە دەست ئینسان دەچێتە دەر کەکابرا ناخافڵ بە هۆی هەڵەیەک لەکاسبی و معامەلە دا کەوتبێتە ژێرباری قەرز، یا ئەوەی بەدڵی خۆیو بۆ خۆی پێی خۆش بێ بیفرۆشێ، ئیدی چاوی پیس چ دەخڵێکی بەسەر ئەو مەسەلەیەوە نییە، ئەگەر بە راستی وەک تۆ دەڵێی وابوبا، دەو دنیایە دا کەس هیچی بەچنگەوە نەدە ما، چونکی هەرکەس زۆرتری بایە، زیاتریان بەغیلی پێوە دە برد، هیچ فکرت لەوەکردووە تەوە؟ هەرچی هەژار و چارە ڕەشە بیر لەو جورە شتانە دەکاتەوە، دە نا مەمانان هیچ باوەڕمان بەوجورە قسانە نییە؟!

**پیرێژن گوتی:** ئەوە ویستی خوایە، ڕەنگە ئێوە بەعزە چاکەکارییەک بکەن ئەو کارانە دەفریاتان بێن و لەو چاوەپیسانە بتانپارێزن.

**کابرا گوتی:** حیسابی چاکەشتێکی دیکەیە، هەرکەس کەچاکە یەک دەکا دەرێی خوادا دەیکا و ئەوە ئەرکێکەکەبۆ ئینسان دیاری کراوەو دەخڵێکی بەسەر دوکەڵی ئەسپەندەرەوە نییە.

بەو حیسابەی تۆ دەڵێی خەڵکان ئەوانەی کەچاکەیان لە دەست دێ، دەتوانن واز لەچاکەکاری بێنن و لەجیاتیان مقەڵێک و هێندێک ئەسپەندەر بکڕن و جارناجار چرەدوکەڵێکی سازکەن.

من ئەوەی نازانم دوکەڵی ئەسپەندەر چاوی پیس و خاوێن ناناسێ و بچێ دە هەر چاوێکەوە ئازاری دەدا.

دەی پرسیارێکی دیکە، لەنێو ئەو هەموو شتانەی دنیا بۆچی ئەسپەندەر بۆ ئەو کارە هەڵبژێردراوە؟

**پیرێژن گوتی:** جا چوزانم! ڕەنگە لەبەر بۆنەخۆشەکەی بێ.

**کابرا گوتی:** وانییە، چوونکی گوڵاویش بۆن خۆشە، عود و سەندەڵیش دەکاتی سوتاندا بۆن خۆشن.

**پیرێژن گوتی:** راستە، بەڵام دەقیمە تدا ئەسپەندەر زۆر لەعود و سەندەڵ هەرزانترە.

**کابرا گوتی:** ئەدی پێستی نارنج و هەنار چی! خۆ ئەوان لە بەر هەرزانیان قیمە تێکیان نییەو بۆنەکەشیان خۆشترە.

**پیرێژن گوتی:** گرینگتر لەوانە ئەسپەندەر دە ئاوردا تەقەی دێ و هاوکات دەگەڵ ئەو تەقەیە چاوی چنۆک و حەسودان دەتەقێنێ.

**پیاوەکەگوتی:** وانییە چونکی ئاوردوی تەڕیش دەئاوردا تەقەی دێ، دەنکە شووتی، کاڵەک، نۆک، نارنج، تۆوی کولەکە، ئەوانە هیچ کامیان دەئاوردا بێدەنگ نین، تۆپ و تفەنگ، خۆ ئەوانەدەنگیان زۆرە، تەقەکاری گوێیەو هیچ دەخلێکی بەچاوەوە نییە، بەو قسەیە پیرێژن و منداڵەکان تێکرا پێکەنین.

**پیرێژن گوتی:** ئاغا بەڕاستی حەوسەلەت هەیە، من چوزانم ئەسپەندەر بۆ باشە؟ هەر ئەوەندەی دەزانم کە پێشینیان ئەسپەندەریان قبوڵ کردووە.

**پیاوەکەگوتی:** قسەی پێشینیانیش، مادام بناغەیەکی پتەوی نەبێ ئەویش بەکارنایە، بۆ نموونە دەرمانی وایان دەکار دێنا، جاری وابوو دەردی سەت هێندە لەکابرای نەخۆش گرانتر دەکرد یا بۆ چارەسەری دەردێک، کاری وایان بەسەر نەخۆش دێنا کە هیچ دەخلێکی بەسەر دەردەکەوە نەبوو، بۆ نمونەکاتێ لاقی سەگ دەشکا ئەوان بە بەنێکی سوورکە چکێکی داریان لەکۆڵەکەی ماڵێ دەبەست و پروایان لەسەر ئەوە بوو

کەلاقی سەگەکەیان بەوکارەچا دەبیتەوە، دەحاڵێکدا هەموومان دەزانین کە ئەوکارەکوجابەرکوجایەو هیچ پەیوەندییەکیان پێکەوە نییە.

رەنگەبەبۆنی سووتانی ئەسپەندەر هێندێک لە مێشوولەو جڕوجانەوەرەکان بپرینگێنەوە، یا بۆ بەرگری لە بڵاوبونەوەی نەخۆشی سەرمابون، شتێکی باش بوبێ، بەڵام دوایەشاخ و باڵیان لێناوەو گەیاندویانەتە ئەو قۆناغە.

**پیرێژن گوتی:** ئاغا، ئێستاکەتۆ ئەوانە دەڵێی، ئەوەی بزانی باشە، کەمنیش وەک تۆ بڕوام بە ئەسپەندەر نییە،چەند ساڵ لە مەوبەر مێردەکەم، نەخۆش بوو و بەجێ وبان کەوت، هەرچەندی ئەسپەندەرم بۆ سوتاند فایدەی نەبوو، پارەکەکورەکەمیان گرت، بۆئازادی ئەویش هیچی پێنەکرا، جگە لەوانە ئەسپەندەر ئەگەرکەڵکی بایە دەبوایە ئەوانەی هاوکاری منن لە هەمووکەس بەختەوەرتر بایەن، کە چی دەبینی دەوپەڕی چارەڕەشی داین، بۆخۆشم دەزانم ئەوەش جورەسواڵێکە، بەڵام چبکەم؟ باشە خەڵک باوەڕ بەو قسانەی ئێمە دەکەن، شتێکمان دەدەنێ، کە م تاکورتێک ژیانی خۆمانی پێ دابین دەکەین، بەناشکوری نەبێ تاقەکورێکم هەیە، ئەویش ئەوە دە بەندیخانەدایە، بێت و ئەوەی نەکەم بێ بژیو دەمێنمەوە.

کابرا بەو قسانەی پیرێژن تێکچو وگوتی:کەوابێ بۆخۆشت دەزانی ئەو ئەسپەندەر سوتاندنە، هیچ قازانجێکی نییە! باش وایەبزانی کەبۆ ئێمەزەرەری زۆرە، پێویستەڕاحەتی جیرانان وەبەر چاو بگری، بڵێ بزانم، ئێمە سەبارەت بەتۆ چمان لە دەست دێ تا بیکەین و تۆ واز لەو کارەت بێنی؟

پیرێژن ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی: خوا خۆت و ماڵ و مناڵت لە قۆرت و تەگەران بپارێزێ، چاکەی ئێوەبۆ من دەحیساب نایە، بەڵام ئەگەر دەتەوێ خزمەتێکم پێ بکەی و لای خوا ون نەبێ، تاقەکورەکەم دەبەندیخانە دایە،کارێکی بۆبکە بەڵکوو ئازاد بێ.

**کابرا گوتی:** فەرموو ئەوەش لە دەسکەوتەکانی ئەسپەندەر، ئەگەر ئەو رۆژەکورەکەت نەچویا دەرکی دوکانی قەساب و ئەو چرە دوکەڵەی ساز نەکردبا، ئەو کێشەو هەرایەش ساز نەدەبوو و کورەکەشت نەدەگیرا.

**پیرێژن گوتی:** ئەی ئاغا، کورەکەشم ئەگەر کارێکی باشتری بوایە، کوا ئەوەی دەکرد؟! کابرا کوتی: لە ئێستا ڕا دە گەڵ ماڵ و مناڵی من رابیوێرە، تەرکی ئەوکارە بکە، منیش هەوڵی خۆم دەدەم، بەڵکو خوا بکاکورەکەتم بۆ ئازاد بێ.

هەر بۆ سبەینێ کابرا ناردی دارو دیواری ماڵی پیرێژنیان ڕەنگ کرد و هەوڵێکی زۆری دا کورەکەی بۆ ئازاد کرد و لە سەر کارێکی باش دایمەزراند و کردی بە پیاوێکی دی.

پیرێژن کەوای دی بەدوای دەڵاڵەکەیدا نارد و پێی ڕاگەیاند کە ئەگەرمشتەرییەکە ماوە ئامادەیە ماڵەکەی بفرۆشێ، دەڵاڵیش ئەو هەواڵەی بەکابرای دەوڵەمەنددا، کابرا بەدوای پیرێژنیدا نارد و گوتی: ئێمە ناهێڵین وا سوک و هاسان جیرانێکی باشمان لەکیس بچێ.

**پیرێژن گوتی:** ئێمە هەمیشە بۆ تۆ دەستە و دوعاین، چونکی ئەوکارە ناحەزەت لەکۆڵ کردینەوە، ڕۆیشتنی ئێمە لە م گەڕەکە تەنیا لە بەر ئەوەیە، ئەو ناوە لێمان بووە بەقیلی سەرکە وای سپی و لێمان نابێتەوە، ئێستا هەرکەس نیشانەی ماڵی خۆی دەدا بەیەکێ دەڵێ: نزیک ماڵی پیرێژنەکەی ئەسپەندەری دەسووتاند، دەمەوێ خانوی لە گەڕەکێک بکڕین، کەکەس بەو ناوە نەماننناسێ.

**پیاوەکەگوتی:** رەحمەت لە ئینسانی تێگەیشتوو بەڕاستی ئەو کەسەی دەفکری ڕاحەتی جیرانیدایە خۆی حەساندووە تەوە، ئێستا بڕۆن بگەڕێن، خانویەکی باشتر ببیننەوە بیکڕن، من پوڵەکەتان بۆدەدەم، پاشان ئەو خانویەی دێنینە سەر سەودا با مەغموون نەبی، پیرێژن رۆیی لە گەڕەکێکی دور خانویەکی کڕی ماڵەکەی گوێستەوەو ئەو ناوەی بۆ هەتا هەتایە لەکۆڵ بۆوە، بەڵام ئەو ناوەلەسەر گەڕەکەکەی پێشوی هەرماوە، کە نیشانەیان دەدا بەکەسێک، دەیانگوت: نزیک ماڵی فڵانە پیرێژن کەساڵان ئەسپەندەری دەسوتاند.

کابرای دەوڵەمەند کە لەو ناوو نیشانە یە زۆر تورە بوو چاری نەما ماڵەکەی فرۆشت و بۆخۆی لەو گەڕەکە ڕۆیشت.

# پەندی چۆلەکە

چۆلەکەیەک بەتەپکە و داوی ڕاوچی یەکە وە بوو، لێی کردەوە، ویستی سەری هەڵپسێنێ و دەتورەکەی باوێ، چۆلەکە کەوتە پاڕانەوە: ئەی ڕاوچی بەرێز هەموو لەشی من دەنێو مستی تۆدایە، نیوەی زیاتری ئێسک و تووک و پەڕو باڵە، خواردنی من هیچ قازانجێکی بۆ تۆ نییە، بەڵام ئەگەر بێت و بەرم دەی سێ نسحەت و ئامۆژگاریت دەکەم، لەوانەیە دە درێژەی ژیانتدا بەکارت بێن، ئەگەر قبوڵت بێ بەر لەوەی بەرەڵڵام کەی یەکەم نسحەتت دەکەم، دوو نسحەتەکانی دیکەش هەرکات فڕیمەسەر ئەو دارە ئەوکات دەیانڵێم.

ڕاوچی تۆزێکی بیرکردەوە: خۆ ژیانی ئینسان تەنیا بۆ زگ نییە، مێشکیش پێویستی بەشت فێربوون هەیە، واباشە بەریدەم بەڵکوو نسحە تەکانی زۆر لەخواردنەکەی باشتر بێ، مستی لێک کردەوەوگوتی: فەرموو بزانم چ نسحەتێکم دەکەی؟

**چۆلەکەگوتی:** لەدوای چووان مەڵێ ئاخ، مەبەستم ئەوەیە ئەگەر شتێک لەکیست چوو خەمی بۆ دامەگەرە، قەدری هەر شتێک هەتا دە دەستت دایە بیزانە، پاشان کە لە دەستت چوو بەردی حەسرەت و پەشیمانی بۆ لە ئەژنۆ مە دە.

**ڕاوچی گوتی:** من بنیادەمێکم خوێندەواریم کەمە، خەڵکیش بەکە مزان و گێلۆکەم دەناسن پێم خۆشە جوانترم حاڵی کەی.

**چۆلەکە گوتی:** بۆ نموونە هە تا لاوی و تاقەت و توانایت هەیە دەتوانی کار و خزمەتێک بکەی، ڕۆژان و دەورانی لاوی بە خۆرایی مەدۆڕێنە، دەنا دەکاتی پیریدا ئەگەر پەشیمان بێوە و بڵێی: ئای بۆ هە تا دەمتوانی فڵانەکارەم نەکرد؟ ئەو جورەقسانە بەکار نایەن، یا ئەگەر دایک و بابت ماون و دەتوانی خزمەتێکیان پێ بکەی، تەمبەڵی مەکە لەقەدەر توانایی خۆت خزمەتیان پێ بکە، دەنا پاشان کە مردن و لە کیست چوون هەزار ئاخ و داخ و حەیف و بریا فلسێک ناهێنن.

ڕاوچی پەندەکەی زۆر بەدڵ بوو، چۆلەکەکەی بەرەڵڵا کرد.

**چۆلەکەکە فڕی و لەسەر لقی دارنیشت و لەوێراگوتی:** ئەی راوچی هەرگیز قسەیەک کەدەگەڵ ئەقڵ و ئاوەزدا ناگونجێ باوەڕی مەکە.

**راوچی گوتی:** ئەوەت شتێکی هێندەگرینگ نەبوو بۆخۆشم ئەوەم دەزانی.

**چۆلەکەگوتی:** کە وابێ پێم خۆشەبەر لە وەی نسحەتی سێهەمت بکەم، لە راستی یەک ئاگادارت کەم.

**ڕاوچی گوتی:** فەرموو بڵێ بزانم ئەو راستی یە چییە؟

**چۆلەکەگوتی:** نێو زگی من دوو مرواری بیست مسقاڵی، کە پێکەوە دەبنە چل مسقاڵ، تێی دایە، ئەگەر بەرت نە دابام و سەرمت هەڵپساندبا و نێو زگمت کۆڵیبا ئەو دوو مرواری یەت دەدیتنەوەو بۆ هەتا هەتایە لە هەژاری نەجاتیت دەهات.

راوچی لە بیستنی ئەو قسەیە، دەست و پێی تێک هاڵا، ماوەیەک عەبەسا و زمانی گیرا، ئەوجار کەوتە پاڕانەوە: چۆلەکەی جوان و نەخشین، وەرەخوارێ، وەرە با بتگرمەوە، سەت حەیف ئاوا سوک و هاسان لە کیسم چووی، بریا فریوم نەخواردبای و بەقسەم نەکردبای، بەڵام ئەگەر بێیەخوار بەڵێنیت پێدەدەم سەرت هەڵناپسێنم و ناتخۆم، دەقەفەسێکت دەکەم، کامەدان و ئاوی دڵخوازی خۆتە بۆتی ئامادە دەکەم، وەک پەزمەندەیەک چاوت لێدەکەم، تائەو سەعاتەی بژی بەکەیفی خۆت خزمەتت دەکەم، جا ئەگەر مردی ئەوکاتی مروارێکان دەردێنم.

**چۆلەکەگوتی:** فایدەی نییە، تۆ بۆ زیندانم بانگێشتن دەکەی، مەگەر نازانی دوو رۆژ ژیان بەئازادی لە دوو هەزار ساڵ ژیانی یەخسیری و دەسبەسەری خۆشترە، مەگین من مێشکی قشقەڵەم خواردبێ، دەنا چۆن بەپێی خۆم دێمەنێو بەند؟!

ڕاوچی کە لە گەڕانەوەی چۆلەکە ناهومێد ببوو بە لارەملی گوتی: دەی قەیدێ ناکا ئێستا کە ناگەڕێیەوە بەلانی کەمەوە قسەو نسحەتی سێهەمیت بکەبەڵکوو ئەو بەکارم بێ.

**چۆلەکە بە لاتاو گوتی:** دوو نسحەتی هەوەڵێ هێندەباش حاڵی بوی، هەر دەبێ نسحەتی سێهەمت بکەم!

**ڕاوچی بەسەرسوڕماوی گوتی:** چوزانی لەنسحەتەکانت حاڵی نەبووم؟

**چۆلەکە گوتی:** ئەی پیاوی حیسابی، حاڵی نەبوون چۆن دەبێ؟ من گوتم حەیف و داخ بۆ ئەو شتەی لەکیست داوە مەخۆ، کەچی دەبینم بە لەدەسدانی من زۆر پەرێشانی، یەکەو دوای ئەوە گوتم: ئەو قسەی کە دەئەقڵ و ئاوەزدا ناگونجێ باوەڕی مەکە، گوتم: چل مسقاڵم مرواری دەزگی دایە، دەحاڵێکدا دەبینی و دەزانی بۆ خۆم بە هەموو توک و پەڕو باڵەوەبیست مسقاڵ نابم ئەی چۆن باوەڕت کرد کەچل مسقاڵ شتی زیادی دەزگی مندایە؟

تۆ شیاوی بیستنی نسحەتی سێهەم نی، چونکی هەرچی دەیبیسی بەو گوێیەت دا دێ و بەگوێیەکەی دیکە تدا دەچێتەدەر.

چۆلەکە ئەوەی گوت و فڕی و لەبەر چاوی ڕاوچی ون بوو.

# بایەخی دەسەڵات

دەرۆژگاری کۆندا ئەوکات کەدنیا بەو جورەی بەسەر نەهاتبوو هاتووچۆی بازرگانان و ڕێبواران و مسافیران بە سواری وشتر و ئەسپ ویەستر و یەکسمەکانی دیکە بوو، زۆر جار بەهۆی تۆفان و نابە لە دی و زۆر شتی دیکە کەسانێک ڕێگایان لێ ون دەبوو و پاشی چەند رۆژ سەرگەردانی لە تونیان دەخنکان و لاشەی بێ ڕوحیان دەو بیابانانەدا دەبو بەخۆراکی قەل و داڵ و بەو جورە توشی بەڵاو مسیبەتی گەورە دەهاتن، هەر بۆیە هەر کاروانێک بۆ درێژە دان بە ڕێگای خۆی پێویستی بە بەڵەدێک بوو.

رۆژێک لە رۆژان هارون ئەلرەشید خەلیفەی بەغدا دە گەڵ پیاوێکی بە لە د و زانا دەسەحرادا توشی سەرلێشێواوی هاتن و ئەو رۆژە تا درەنگان هەر رۆیشتن و بە سەرهیچ ئاوو ئاوەدانییەکدا نەکەوتن.

کابرای بەڵەد دەبوایە ڕاوەستێ تا شەو دابێ ئەو کات لە ڕوی ئەستێرەکان ڕێی خۆی بدۆزێتەوە بە ڵام هاڕون لەو فەنن و فێڵەی بەڵەد بێ هەواڵ و لەتونیان تەواو شپرزە ببوو وهیچ هومێدی بە نەجات بوونی نەبوو.

**کابرای بەڵەدگوتی:** واباشە دەودەم وکاتەیدا کە ترسی مەرگ ئێمەی لێک نزیک کردووە تەوە بۆ ئەوەی بخافڵێین و تونیایەتیمان لە بیر بچێتەوە پرسیارێکت لێ بکەم.

خەڵیفە دە حاڵێکدا کە لە تونیان هەموودم و لێوی وشک هەڵاتبوو گوتی فەرموو.

**کابرا گوتی:** ئەگەر هەروا ئەو شەویش دەو سەحرایەدا سەرگەردان بمێنینەوەو سبەینێ دوبارە بکەوینەوە بەر تینی ئەو خۆرە لەش پروکێنە، بە دڵنیایی زۆر لە ئێستا تونی تر دەبین، ئەگەر دەو دەم وپیشکەش کەم.

**کابرا ماوەیەک بێدەنگ ما پاشان پرسی:** دەی ئەوە هات و ئاوەکەت خواردەوە و تونیایەتیت شکا، بەڵام کوت وپرتوشی نەخۆشی یەک هاتی

با ڕونتر بڵێم  بەری میزت گیراو ئەو ئاوەی خواردوتەتەوە بۆت لە لەشت وەدەرنەنرا، ئەگەر حەکیمان لە چارەی دەردت ناهومێد مان، دەو سەعاتیداکەسێک پەیدابێ و بتوانێ چارەی دەردت بکا، دەبەرامبەر ئەو چاکەیدا، چی دەدەیەی؟

**خەڵیفەگوتی:** ئاشکرایە، حازرم نیوەکەی دیکەی سەروەت و دەسەڵاتمی بدەمێ.

دەوماوەیەدا بەڵەدکاری خۆی کردبوو، ڕێگای دۆزیبۆوە، سیوادی شاری بەغدا لەدور ڕا وەدەرکەوت، دەستی ڕاداشت و گوتی: هۆەتا، ئەوەش شاری بەغدا، بەڵام جەنابی خەڵیفەگفتگۆی ئەورۆمانت  لە یاد نەچێ و بایخی راستەقینەی دەسەڵات دەودنیایە تدا هەمیشە لەبیربێ.

# ئاهەنگێ بۆ خودا

دڵتەنگ و لارەمل و دەستەوەستان دەگێژاوی ژیاندا چەنگەپرچەی بوو، مەلەوان نەبوو نەیدەتوانی لەگۆمی نەداری و چارەڕەشی خۆدەرباز و بۆ ماوەیەکی کورت هەست بە خۆشی ژیان بکا.

نەداربوو، هەژاربوو، پیربوو، هەرچی ناوی خۆشی بوو لێی زویر بوو، لە مناڵێوە لە نەیشابوور بەخەم و شادی ئەو خەڵکەوە ڕاتبوو، هەر لەوکاتیشڕا لەرەی ئەنگوستی باوکی کە بەسەر سیمەکانی ڕوبابدا خزیبوو سەرنجی ئەویان بۆلای خۆیان ڕاکێشابوو، تازە هەستی بەتاڵ و سوێری ژیان دەکرد، باوکی مردو ڕوبابەکەی بۆ بەمیرات بەجێ هێشت، زۆری پێ نەچوو لەباوکی نەدەماوەو تەنانەت لەویشی باشتر لێدەدا و کۆڕی بەزم و زەماوەندی خەڵکی نەیشابور بێ دەنگی روبابی ئەو تامێکیان نەبوو، بەڵام چی کردبا؟ لەو شارەکەم کەس لاگیری هونەر بوون و ساز لێدانیش بەدەستوری حاکم، تەنیا دەبوو دەکۆڕی بەزم و زەماوەنددا لێدرابا.

وردە وردە کەوتە خەزانی ژیان و بەفری پیری لەسەری نیشت و دەست و پەنجەکانی توانایی جارانیان نەماو رۆژ بەرۆژ لەژومارەی داخوازەرانی کەم بۆوە.

لارەمل و برسی و دەستەوەستان مابۆوە، کەسیش خێری پێ نەدەکرد، چونکی لایان وابوو لۆتی و چاوەشەو خێر و ئیحسانی پێ ڕەوا نییە.

پیرەی داماو تەواو نان پراوو لێقەوماو، نەکەس ناڵەی ڕوبابەکەی بەفلسێک دەکڕی و نەکەسیش بەخێر و پیاوەتی پەنجەنانێکی دەداوێنی داویشت. برسی بوو، چووبا لەکام دەرکی دابا و سواڵی کردبا؟ بەڵام نا، خۆ ئەو سواڵکەر نەبوو، روباب لێدانی بەهونەری خۆی دەزانی و وەتی فرچکی گرتبوو ئۆگری ئەو کارەببو و چیدیکەی نەدەزانی.

ئەی خوایە، ئەوەچکارێک بوو لەمناڵیوەتوشی هاتبوو؟ لەچارەڕەشیان هاوار و فیغانی لێوە هەستابوو، دڵشکاو و سەر لێشێواو نەیدەزانی ڕوو دەکوێ کاو کوڵی دڵی کڵۆڵی بەلای کام هاورازەوە هەڵڕێژێ، روبابەکەی دەست دایەو دەژێر شاقەلی کەواکەیدا شاردێوە.

ڕۆیشت و رۆیشت، لەشی ئەسیری هەنگاوەکانی بوو. بۆ خۆشی نەیدەزانی مەخسەدی کوێیە.

کەوشیار بۆوەخۆی دەمیحرابی مزگەوتی گەورەی نەیشابوردا دی.

چێشتەنگاو بوو، جگە لە خۆی کەس دەمزگەوتا نەبوو، بەئەهوەنی ڕوبابەکەی هێنا دەر و نەرم دەستێکی پێدا خشاند.

نەغمەی دڵنەوازی دەنێو مزگەوتی کپ و خامۆشدا دەنگی داوە،سەری بۆ ئاسمان هەڵبیری، کوورەی دەروونی کەوتە جۆش، کەوتە هاوار و سکاڵا، ئاخر ئەو پەنای بێ پەنایان بوو.

لاڵاوە، پاڕاوە، کڕوزاوە، فرمێسک بەگوڕ ڕژانەسەر داوێنی.

خوایەگیان: نازانم بەتۆڵەی کامەتاوان، دەبێ هێندە مەینەت و مەڕاڕەتی رۆژگار بەکۆڵمەوەبێ؟ خۆ خراپەی کەسم ناوێ، خوایەتۆی کەڕۆزی مار و مێرو دابین دەکەی، خاوەنم ئەتۆی خۆراییم مەکە، بۆخۆت دەزانی هیچ کارێکی دیکەنازانم و هونەری من تەنیا ئەو ڕوباب لێدانەیە. بێ مشتەریم، چدەبێ خوایەگیان ئەورۆ بۆخۆت مشتەری من بی؟ بۆ خۆت دەزانی دەڵێم چی، دەمەوێ کاربکەم ئاخر خوایەگیان کاری منیش ئەوەیە، بەڵام چبکەم درەنگم بەخۆزانی و ئێستا کەس نایێتەگوێگری دەنگی سازەکەم و کەسیش پەنجەنانێکم پێ ڕەوا نابینێ، کەس منی ناوێ و هەموو لێم دەپرینگێنەوە، ئیدی هەرگیز ڕوبابی بۆ ئەو خەڵکەلێ نادەمەوە... لەمەو بەدوا هەر بۆ تۆی لێدەدەم، ئەگەر نەمزانی باشی لێدەم لێم ببورە، هەر ئەوەندەی دەزانم و پێشکەشتی دەکەم ، دەشزانی دەغەڵی تێدا ناکەم، لەوەی چاتری نازانم، بۆخۆت کەریمی دەزانی چبکەی،چاکەشکور ئێستاکەس لێرەنییە، دەنا بەگەورەییت سوێند لەماڵەکەی تۆش وەدەریان دەنام.

پیرەی دڵشکاوو هەناسەساردفرمێسکی چاوانی نەدەگیرسانەوە، دەگریاو ڕوبابی لێدەدا، دەو حاڵەی داکەئاگای لەخۆی نەمابوو، نەغمەی خواوەندی تێکەڵاوی دەنگی سازەکەی ببوو، ئیدی پێی وانەبوو جگەلەخۆی کەس لەسەر دنیایەیە.

روباب لێدان، ئەویش دەمیحرابی مزگەوتدا!؟ بەڕاستی دنیای عارفان سەیرە! گەرم داهاتبوو، دەنگی شێعر و گریان و ناڵەی روبابی تێکەڵ یەک کردبوو هێندی لێدا و لێدا، تا بێحاڵ و بێ هۆش سەری بەعەرزی میحرابەوەناو خەوی لێکەوت.

مجێوری مزگەوت، هەر لە ئەوەڵێ ڕا لەگەڵ بیستنی یەکەم دەنگی ڕوبابەکەخۆی گەیاندە ژوری مزگەوت و بەبێدەنگی لەگۆشەیەک ڕاوەستاو تەواو لەقسەو داد و هاواری پیرەحاڵی بوو. هەرچی کرد نەیتوانی لۆمەی ئەو پیرە دڵشکاوەبکا، لەحاڵی خۆیدا بەجێی هێشت و یەک شەق ڕوی دەخانەقای ئەبوسەعیدکرد.

ئەبوسەعید ختمی دەرسەکانی زەمانی خۆی بوو و لەتەواوەتی ئەوانەی عالمان و عارفان و دەروێش مەسلەکان دەیانگوت دەگەیشت و تەنانەت لەوانیشی پتر دەزانی، لەنەیشابوور خانەقایەکی بوو لەوێ کۆرومەجلیسی دەرسی پێک دێنا و شاگردان و مریدان وەک پەپولەلە دەوری شەمی ڕوی دەهاڵان، زۆر بەڕێز و زانا بوو، هێندێ لەعالمەکان دەیانبوغزاند و دەیانگوت بەهەڵەدا رۆیشتووەو رێی لێ ون بووە، هێندێکانیش لایان وابوو پیاوی خوایەو ڕێز لێگرتنی ئەرکی سەرشانە.

کورتی ببرینەوە، مجێوریش یەکێ لەمریدانی شێخ ئەبوسەعید بوو هات و هەرچی دیتبوی و بیستبوی بۆ شێخی گێڕاوەو گوتی: سەرم لێ شێواوە، نازانم چبکەم؟ سازلێدان ئەویش دەمزگەوتدا شتێکی یەکجار غەریبە، بەڵام زگم پێی دەسوتێ، ئەو حەقی سازلێدانەکەی لەخوا دەوێ، تێماوم هاتووم ڕێگایەکم بەنیشان دەی، هەرچی بێ ڕەوا نییەئەو ئینسانە بەناهومێدی لەو دەرگایەبچێتە دەر و لای وابێ کەخواش جوابی کردووە.

شێخ گوتی: دانیشە، بزانین چی لێدێتەوە، مجێور دانیشت و شێخ خەریکی کاری خۆی بۆوە، زۆری پێ نەچوو پیاوێک وەژوور کەوت کیسەیەکی پێ بو، نایە بەردەستی شێخ و گوتی: ئەی شێخ ئەوەپوڵێکەنەزرم کردبوو بیدەم بەتۆ تا بیدەی بەئینسانێکی لێقەوماو، ئێستاش گرفتەکەم لەسەر رێ لاچووە، هێناومەچۆنی پێت باشەوای لێ بکە، ئەوەی گوت و رۆیشت، قوتابییەکانی شێخ چاوەڕوان بوون لەو پوڵەشتێکان پێ بگا، بەڵام پێچەوانەی چاوەڕوانی وان، شێخ

کیسەپوڵەکەی دا بەمجێور و گوتی: ها بیگرە یرۆ ئەوەحەقی ئەو پیاوە پیرەیە، ئەورۆ ئەو لەهەمووومان چاوەلەدەست ترە.

یرۆ بیبە، بەڵام نەکەی بڵێی کێ ناردویەتی، بڵی ئەوەحەقی کارێکەکەکردوتە، بڵێ ڕسقێکەخوا بۆی ناردووی، خەرجی کەو شوکری ئەو بەجێ بێنە بەڵام هەرکات دڵت تەنگ بوو، وەرە لێرە لەبەر خوای خۆت بپاڕێوە بەڵام جارێکی دیکە لێرەروبابی لێمەدەوە، یرۆ خانەقای ئەبوسەعید، لەوێ بەکەیفی خۆت لێیدە، ئەوێ مزڵی دەروێشانەوکەس هیچت پێ ناڵێ.

ئەوکات مجێور گەڕاوە راوەستا، تا پیرە وەخەبەر هات، ئەوکات کیسەکەی لەپێش دانا و قسەکانی شێخی بۆ دوپات کردەوە.

پیرە لەخۆشیان کەوتە سوژدە: خوایەگیان زۆر شکور، بەراستی خوایەتی هەر لە خۆت دەوەشێتەوە، لە هەموو کەس باشتر قەدری هونەر وسازەکەی من دەزانی، تازەئیدی، جگە لە تۆ بۆکەس ڕوبابی لێ نادەمەوە، پاشان دەستی دا کیسەکەو ڕوبابەکەی دەژێر ئاتەگی کەواکەیدا شاردەوە و هیچی لە مجێور نەپرسی و وەک شێتان لە مزگەوت وەدەر کەوت.

مجێور بەغارکەوتە شوێنی، بابەگیان لە بیرت نەچێ هەرکات ویستت نوێژبکەی یا دەگەڵ خوای خۆت ڕازو نیاز بکەی وەرە ئێرە، بەڵام لەمەوبەدوا سازی مەهێنەوە ئێرە، روبابەکەت بەرە لەخانەقای شێخ ئەبوسەعید لێیدە.

پیرە بەڕوانینێکی بەتەوسەوە دەمجێور فکری وگوتی: ئەبوسەعیدکێیە؟

ئەو ئەگەر پیاوی خوا بێ، دە ڕوا هەموو کارەکانی خۆی بەجێ دێڵی و ئەویش هەر وەک من تەنیا هەر بۆ خوای لێ دەدا پیرە ئەوەی گووت و مجێوری بەسەر سوڕماوی بەجێ هێشت.

# سەودای شەیتانی

دە رۆژگاری کۆندا، لە بەر ئەوەی هام و شۆی نێوان شارەکان یەکجار زۆر کەم بوو کەمتر هەواڵی یەکتریان دەزانی، بازرگانەکان بۆئەوەی لە نزیکەوە لە مەزەندە و قیمەتی شتەکان لە شارەکانی دیکە حاڵی بن بۆخۆیان سەفەریان دەکرد، بە ڵام بەو هەموو تێبینی و سەرنجەیەوە زۆرجار بە هەڵە دەچوون، بۆ نموونەکوت و پرشتێک لە وڵاتێک قات دەبوو و تەنانەت بۆ نموونەش وەگیر نەدەکەوت؛ ئەو هەواڵە درەنگ بەگوێی بازرگانەکان دەگەیشت، ئەوانیش لە ماوەیەکی زۆر کورتدا بەواتەو مەسەلی کۆن دەیانکردەکەرمیز و چاولێکەری و هەرکەس لەحاست خۆیەوە لەوشتە نایابەی ساز دەکرد و دەیناردە ئەو وڵاتە، زۆری پێ نەدەچوو ئەو شتە هێندە زۆر دەبوو کە ئەگەر بەخۆراییش دابایان هێشتا هەرگران بوو، هەر بەو هۆیەکەم تاجری وا هەبووچۆنیەتی بازاڕی بۆ پێش‌بینی بکرێ، رێگا و بانەکانیش هێندە ئەمین نەبوون ڕێگر و دز و جەردە و سەدان مەترسی دیکە ببوونە بەهۆی ئەوە ی دەستەیەک کاروانچی ببنە هاوسەفەر تا دە کاتی تەنگانەدا دەفریای یەک بێن.

دەسەفەری دەریاشدا دزی دەریایی و نوقم بوونی کەشتی وپاپۆرمەترسی گەورە بوون، بەو جورەکاری توجارەت زۆر گران و دژوار بوو، زۆر جار تاجری دەوڵەمەند و بەناو هەموو ماڵ و داراییەکەی بەتاڵان دەچوو و هیچی بەچنگەوە نەدەما، بەڵام کاری توجارەت سەیرەکەی دەوە دا بوو هیچ تاجرێک بە جارێک ڕوت کران و توشی زەرەر بوون وازی لە کارەکەی نە دێناو بەقەرز و قۆڵەیا هەرچۆنی بۆی کرابا سەر لە نۆێ خۆی بۆ کاروانێکی دیکە ئامادە دەکردەوە و بە یەک دوو جاران ئەو زەرەرەی تێهەڵدێناوە.

دەو داستانەدا باسی دوو تاجری هاووڵاتی دەکەین کە ئەو ساڵ و زەمانی بە سواری کەشتی کۆنەکان سەفەری شارەکانی قەراغ

دەریایان دەکرد و دە و سەفەرانەدا بە لانی کەمەوە دوو سێ مانگیان پێدە چوو.

دە یەکێ لەو سەفەرانەدا هەردوکیان شت و مەکێکی زۆریان کڕی، پاش ئەوەی بارەکانیان لە کەشتیدا، لە یەکێ لە وەتاغەکانی کە شتیدا بوونە هاومزڵ.

باری یەکیان ڕۆن و ئەوی دیکەیان قاپ و قاچاغی مسی بوو، هەردووکیان بەتەمای خوا ئەو شت و مەکانەیان دەبرد بیانفرۆشن و ئەگەر پارەی نەغدیش نەبا سەربەسەر بەشتی دیکە کە زانیبایان لەشاری خۆیان خێرێکی دەکا دەیانگۆڕیوە.

حەوتەیەک بووکە شتێکەیان دەدەریادا بوو، رۆژی هەشتەم لە راست کەشتی یەکی دەحاڵی گەڕانەوە دا ڕاهاتن، ئەوکات و زەمانی ئەگەر دوو کەشتی تووشی یەک هاتبان بە شانسێکی گەورەیان لەقەڵەم دەدا، چونکی هەر نە باکەشتی وانەکان لە چۆنیەتی رێگایان دەپرسی، ئەگەر مەترسی یەک لە سەر ڕێیان با بە لایهیەکیدا دەڕۆیشتن و خۆیان لێ دەپرینگاندەوە.

تاجری ڕۆن پیاوێکی زیرەک و پیتۆڵ و حیسابگەرێکی لێهاتوو و کاسپکارێکی بەتەواو مانا بوو، لە هەموو هەل و دەرفەتێکدا لە قیمەت و مەزەندەی بازاڕی دەپرسی ونەیدەهێشت توشی زیان وزەرەر بێ.

بەڵام کابرای مسفرۆش، پیاوێکی ساویلکەو بێ خەیاڵ بوو وگوێی نەدە دا هیچ و دەیگوت: ئێمە شتێکی دەبە ین بۆفرۆشتن، قازانج و زەرەر بەدەست ئێمە نییە، هەرچی یریارە ببێ ئەوەدەبێ و پێشی قازانج و زەرەر بەکەس ناگیرێ.

تاجری مس خەوتبوو، تاجری رۆن بەپەلە هاتەسەرێ و ئەوەندەی کەشتیوانەکان پێداویستێکانی یەکتریان دابین کرد و لە چۆنیەتی رێگایان پرسی ئەو دەمەزەندەی بازاڕگەیشت و زانی کە نرخی ڕۆن یەکجارکەم و بە پێچەوانە مس دەوپەڕی بەنرخی و ڕەواجی خۆی دایە، ئەوەی زانی و گەڕاوە، زۆر تێک چوو، ئەو هەموو ڕۆنەبێت و بەو مەزەندەی دەیلێن بیفرۆشێ لە قازانج تەنیا ماندویی رێیەی بە نسیب دەبێ.

کە گەڕاوە نێو هۆدەکەی، دیتی تاجری مس هەروا خرپ خەوتووە، دەمێک دانیشت تا وەخەبەر هات، روی تێکرد وگوتی: ئەگەر وەڕەزی با

بچینە سەرێ و چاوێک لە دەریا بکەین، دەڵێن کەشتی یەکی مسافیر هەڵگر لە تەنیشت کەشتێکەی ئێمە لەنگەری هاویشتووە.

**تاجری مس گوتی:** حەوسەلەی هیچم نییە، چاولێکردنی چی؟ بەناشکوری نەبێ خۆ چ خزم و ئاشنایەکمی تێدا نییە.

**تاجری ڕۆن گوتی:** منیش هەروەک تۆ، قەت حەوسەلەی ئەو جورە خۆ خافڵاندنانەم نییە، نازانی مسافیرەکانی کەشتی ئێمە چۆنیان لێ هاڵاون، هەر دەڵێی نەدی و بدین و قەتیان کەشتی دیکە نەدیوە.

تاجری ڕۆن ئۆقرەی لێ یرابوو، بەو بازاڕەکەسادەوە ئەوهەموو ڕۆنەی چ لێبکەم؟ ئای ئەگەر توانیبام لەگەڵ مسی ئەو کابرایە سەربەسەرگۆڕیبامەوە چاک ئاسوودە دەبووم.

پاش ئەوەی کەشتی وەڕێکەوت، تاجری ڕۆن سەرەتای قسانی دامەزراند پارەکە رۆنم برد قازانجێکی باشم وەگیرکەوت لەو سەریش ڕا کوتاڵم هێناوە، چت لێ نەشارمەوە یەک لە یەکێ باشتر بوون.

**تاجری مس گوتی:** کار و توجارەتی من هەمیشەگۆترە و عەلابەختەکی بووە و هێندەم گوێ نەداوەتە ئەوەی بزانم زەرەرێ دەکەم یا نا، جاری وابووە زۆرم دەبارەی سەودایەکدا بیرکردووەتەوەکەچی لە پاشان بۆم دەرکەوتووە بەهەڵە چووم و تووشی زەرەر بووم، جاری واش بووەلەگۆترەپێم داداوە و زۆر بە قازانجم تەواو بووە، ئێستا هاتوومە سەر ئەو باوەڕە: هەرچی دەبێ ببێ، ئەوە دەبێ و بیرلێکردنەوەی ناوێ.

**تاجری رۆن گوتی:** ئەڵبەت کە دەبێ پیاو هومێدی بە خوا بێ، بەڵام جاری وایە بێفکری پیاوی توشی دەردەسەر دەکا، بۆ نموونە ئیشاڵڵا کە تووشی زەرەر نابی بەڵام ئێستا ئەو وڵاتەی کە ئێمە دەمانەوێ بچین بەلانی کەمەوە دەکان و مەعدەنی گەورەی مسی لێیەو لەوێرا، مس بۆ جێگایان بەڕێ دەکرێ ئەگەر لە شێتێکیش بپرسی دەزانێ کە تۆ دەوسەفەرەدا تووشی زەرەر دەبی.

**تاجری مس نێوچاوانی تێک ناو گوتی:** زەرەر؟ پێم وانییە، چونکی مس نێوی خۆی بە خۆیەوەو قەت کۆن نابێ و ناسوتێ و ژەنگ ناهێنێ و مۆرکە لێی نادا، دەساڵی دیکەش مس هەر مسەو هەروەک خۆی دەمێنێتەوە، تەنیا نیگەرانی من ئەوەیە یەک تەنم و دەو سەفەرەدا بۆ گەڕانەوە بەپەلەم، ئەگەر زوو نەگەڕێمەوە ماڵ کەسم نییە بەکارەکانی دیکەم ڕابگا.

**تاجری ڕۆن گوتی:** بەو حیسابە دەبوایە ڕۆنەکانی من ئی تۆ و مسەکانی تۆ ئی من بان، چونکی من دەو سەفەرەدا زیاتر مەبەستم فێربوونی زمانە نەک توجارەت، من دەتوانم پەلەی نەکەم، هەرکات مەزەندەی مس رۆیشتە سەر ئەوکات بیفرۆشم، بەڵام ڕۆن خواردەمەنییەو مشتەری دەوری پیاوی دەدەن و زۆر زوو لە دەستمی دەردێنن.

**تاجری مس گوتی:** دیتت کاری دنیا هەمووی بەراوەژویە؟

**تاجری ڕۆن گوتی:** هەرچەند پارەکە لەڕۆن قازانجێکی زۆر و بەرچاوم وەگیر کەوت بەڵام ئامادەم مایە بە مایە ڕۆن و مسەکان پێکەوە بگۆڕینەوە، بەتەمای خوای هەرچی دەبێ با ببێ، بەڵکو خێری هەردووکمان دەوەی دابێ، بۆ خۆشم نازانم بۆچی کوت و پڕ ئەو بڕیارم بە دڵیدا هات؟

**تاجری مس گوتی:** قسەیەکم نییە، بەڵام عەیبی کار دەوەدایە ڕۆن ڕاگرتن زۆر زەحـمەتە، ئەگەر زوو نەغد نەبێتەوە پاکی خرا دەبێ، بەڵام مس وا نییەکاری خوایە لەئاسنەکەی را بگرە هەتا مس و رەژی و زێر و زێو، هەمویان بەرەکەتی زەوین و هەتا بمێننەوە هیچیان لێنایە.

**تاجری ڕۆن پێکەنی وگوتی:** بەو زمانەی پێتەوەیە دەبوایە دەڵاڵ بای، بەڵام کاسپی ئێمەچ دەخڵی بەو قسانەوە نییە، شتێکی دەکڕین و شتێکی دەفرۆشینەوە بەرەکەتیش بەوانە ناڵێن، شتانێک بەرەکەتن کەپەیوەندیان بەمان و نەمانی ئینسانەکانەوە هەیە.

ماڵێک دەتوانێ هەتا هەتایە زێر یا قاپ یا مەجۆعمەی مسی نەبێ بەڵام تاقە رۆژێک بێ ڕۆن گوزەرانی بۆ ناکرێ، ڕۆن هەمیشە پارەی نەغدەو پەیوەندی بەژیانی ئینسانەوە هەیە وکان و چاڵاویشی نییە تا هەرکات پێویستیان پێی بێ لێی هەڵێنجن، دەسرەنجی ئینسان و شیرەی گیانی ئاژەڵەکانە.

**تاجری مس قاقایەکی لێدا و گوتی:** زۆر باشە، هەرچۆنێکی پێت خۆشە وا دەکەین نازانم بۆچی لە ناکاو خوا دەدڵی منیشی نا ئەو سەودایەی قبوڵ کەم!

**تاجری ڕۆن لە خۆشیان دڵی لەرزی وگوتی:** مبارەکە، لە بازاڕی ئیستامبووڵ دەڵێن: ئەڵڵا بەرەکەت وێرسن، چ باشە ئینسان هەموو زمانێک بزانێ.

**تاجری مس گوتی:** ئەرێوە ڵڵا زۆر باشە، بەڵام بەداخەوە من کوردێکەی خۆشم بەباشی نازانم، فەرموو با شتەکانمان نەزری یەکتر کەین.

دەستیان دەدەستی یەکتر نا:

- ئەوەمن مسەکانی خۆم بەمایەی خۆی نەزری تۆ کرد.

- ئەوەمنیش رۆنەکانی خۆم بەمایەی خۆی نەزری تۆکرد، لە جیاتی پارەمسەکانی تۆ هەڵدە گرمەوە.

- ئەوە قبوڵم کرد.

هەرلە جێوە لیستەی قیمەتی شتەکانیان دا بە یەکتر و سەودایان سەری گرت و معاملەیان پراوە.

تاجری مس بۆ خۆشی نەیدەزانی چدەکا، بەڵام تاجری ڕۆن دڵنیا بوو کە ڕۆنەکە زەرەر دەکا و مسەکان یەکاویەک قازانجێ دەکەن.

بەڵام ڕوداوێک کوت و پرهەموو ئەو حیساباتەی تێکدا، چەند حەوتو دوای ئەو سەودایە چەند فرسەخێک مابوو بگەنە مەخسەد، دەشەوێکی تاریک و تنوک و ئەنگوستە چاودا هەوا هەلیکردە باو باکوت و تۆفانێکی عەجایب و دەماوە یەکی زۆر کورتدا، دیوارەی کەشتی تێک شکا و لێشاوی ئاو ڕژا نێوکەشتی، کەشتیوان دەستی تێک هاڵاوگوڕراندی: هاوسەفەران، دۆستان، گیانی هەموومان دەمەترسیدایە، ئەگەر بێت و کەشتی قورس بێ نوقمی ئاو دەبێ چارەیەکمان نییە جگە لەوەی کەشتێکە بەتاڵ کەین وگیانی خۆمان نەجات دەین، ئەو دوو تاجرە لەوکەسانە بوون کە بەو ڕوداوە تەواو تێک چوون وگوتیان: جا ئەگەر پریار بێ ماڵ و دارییمان نەمێنێ واباشە خۆشمان دەگەڵی لە ناو بچین، ژیان بەدەستی بەتاڵەوە نەبوونی باشترە.

کەشتیوان گوڕراندێوە: دەزانم ماڵی دنیا خۆشەویستەو لە دەسچوونی سەرمایە بەڵایەکی گەورەیە بەڵام ئەو قسانەی ئێوە قسەی بێکورسین، ئێرە دەریایە و ئێستا پەلەقاژەی مان و نەمانمانە، ئەوەی لە هەموو شتێک گرینگترەگیانی خۆمانە، دیوارەی کەشتی تێک شکاوە، ئەگەر ئاو بە تەواوی بێتە نێوی هەمووومان تێدا دەچین، دێرەدا تەنیا من فەرماندەم و دەزانم چبکەم، ئەگەر بێت و بەرگری کارەکەم بێ،

کەشتێکەم بەتوون، بەڵام بۆ خاتری گیانی ئەو هەموو خەڵکە، ئێوەش دەگەڵ بارەکانتان دە دەریا داوێم.

تاجرەکان بێدەنگ بوون و کارگەرەکانی کەشتی بەپەلە هەرچی باری دە کەشتی دابوو تەنانەت هێندێک لەشتەکانی کەشتیش کەبە ڕواڵەت زیادی بوون دە دەریایان هاویشتن، وردە وردە کە شتێکە سووک بوو تەواو وەسەر ئاوکەوتەوە،کارگەر و مسافیرەکان بەتێکڕایی کەشتیان وەبەر سەوڵان داو توانیان لە گەڵ تاریک و ڕوونی بەیانی خۆیان بگەیێننە ئیشکایێ.

تاجرەکان لە ناراحەتیان هێز و توانای قسەکردنیان نەمابوو، ڕاماوو حەبەساو بیریان لە قازانجی ئەو سەفەرەیان دەکردەوە.

ئەو مسانەی کە تاجری ڕۆن کڕیبوونی نوقمی ئاو بوون، بەڵام خیگەڕۆنەکان کە تاجری مس ببوو بە خاوەنیان وەسەر ئاو کەوتبوون و شەپۆلەکان ئەوانیان بەرەو ڕەن و لێواری دەریا ڕادە دا.

دەریا پیشەی خۆیەتی، دەرقەتی هەرشتێ بێ قوتی دە دا و هەرچی پێی قوت نەدرێ ڕایدە داتە دەرێ، ڕۆنیش یەکێک لەو شتانەیەکە دەئاودا قوم نابێ. هێندێک لە خیگەکان بەشەپۆلی دەریاکەوتنە ڕەنێ و ئەوانی دیکەش کە هەروا لە سەر ئاو مابوونەوە، پاش ئەوەی دەریا ئارام بۆوە، بەهاوکاری مەلەوان و لۆتکەو بەلەمەکان لە ئاو گرتیاننەوە.

بەو جورە تاجری ڕۆن بەو هەموو زیرەکی و فێڵەزانێیەوە هەرچی مسی کڕیبووی لە کیسی داو تاجری مسیش بەو هەموو گێلی و دڵپاکێیەوە ڕۆنەکانی گەیاندە بازاڕو بەمایەی خۆی فرۆشتنێوە.

بەڕاستی کوردان باشیان گوتووە: داعبای زیرەک بەدندوک پێوە دەبێ.

تاجری دڵپاک وەختایەک بەپوڵی خۆی گەیشتەوەگوتی: ئەگەرچی دەو ڕوداوە دا مایە باش هاتمەوە، بەڵام بەڕاستی بۆ تۆ ناڕەحەتم، خەتای من مەگرە، بۆخۆت پێشنیاری ئەو سەودایەت پێکردم.

**تاجری زیرەک گوتی:** نا براکەم هەرچی کردم بۆخۆم لەگەڵ خۆمم کرد،ئەو جورە ڕوداوانەکوت و پڕو پێش‌بینی نەکراون، گلەییم لەتۆ وکەشتیوان نییە ئەگەر دە دەریایە نەهاویشترابان خوا دەزانێ ئێستا هیچ کاممان زیندوو نەدەماین، براگیان با لێت نە شارمەوە،

وەختایەک پێشنیاری ئەو سەودایەم پێکردی دڵنیا بووم ڕۆنەکەم زەرەردەکا، من بە نیەتێکی خراپەوە ئەو سەودایەم لەگەڵ تۆکرد، ویستم کڵاوت لە سەر نێم، نەمزانی هەرچی دەیکەم دەگەڵ خۆمی دەکەم.

بەڕاستی کوردان ئەوەشیان باش گوتووە:

هەرکەس چاڵی بۆ خەڵک هەڵقەنێ بۆ خۆی تێی دەکەوێ.

# قسەی لادێیی

حاکمی نەیشابور، بەدڵ حەزی لەوە دەکرد: کەدە هەموو هەل و مەرجێکدا ئارام و لەسەرە خۆ بێ و دەگەڵ کەس توند و تیژی نەکا، بەڵام جاری وابوو دەحاڵ و هەوایەک دەکەوت بەواتەی ئەورۆیی ئامپێری وەها دەڕۆیشتە سەر، دۆ و دۆشاوی تێکەڵ دەکرد و لە ئەنجامدا دڵی زۆرکەسانی لە خۆی دێشاند و پاشان بۆخۆی تەواو پەشیمان دەبۆوە.

جاری وابوو وەهای ڕق لەدەوروبەریانی هەڵدە ستا، ئەگەرکەسی وەگیر نەکەوتبا تا بیانوی پێ بگرێ ورقی خۆی پێ پرێژێ هێندەی دڵ دەگیرا دنیای لێ دەبوو بە چەرمی چۆلەکە.

هەرکاتیش دڵی خۆش بایە ئەوەندەی کاری سوکەڵە و بێ تام دەکرد و ناحەز دەجوڵاوە کە دەشان و شکۆی ئەودا نەبوو.

رۆژێک کڵاوی خۆی کردە قازی وگوتی: کارەکانی من زۆر بەخراپی دەچنە پێش، ئەوەش لە خوو خدەی خراپی خۆم ڕایە. بۆچی دەبێ من دەبەڕامبەر خۆشی و ناخۆشی ژیاندا قووڵ ومندو لە سەر خۆ نەبم؟

لەوانەیە نەخۆش بم، یا دەمێشک و بۆچوندا تەواو نەبم، وا باشە خۆم بەنیشان حەکیمێک بدەم، بەڵکوو ئەو ئاکارانەی من دەرمانێکیان هەبێ.

حەکیم پاشی چاولێکردن گوتی: تا ئەو جێیەی من تێبگەم هیچ نەخۆشییەک دە لەشی تۆدا نییە، نەخۆشی تۆ، نەخۆشی روحی یەو ڕیشەی دەگەڕێتەوە بۆدەورانی منالّیت، تۆ لەسەرەتا ڕا بەنازداری وخۆ بەزل زانی پەروەردەکراوی،هەر بۆیە دەبێ ببوری، ئاکارەکانت منالّانەن و هەر لەسەر ئەو ڕێوشوێنی دەڕۆی،دەردی تۆ بەدەرمان چارەی نایە، دەبێ زیاتر کتێبان بخوێنێوە و لە قسەو پەند و ژیاننامەی گەورە پیاوان پەند وەرگری و دروشمێک بۆ ژیانی خۆت هەڵبژێری کە هەمووکات لە بەر چاوت بێ و تۆ بۆ لە سەرخۆیی و هێمنایەتی هان بدا، کاتێ ڕوحت

نەخۆشە لەشت چ پێویستی بە دەرمان نییە و دەبێ ڕوحت دەرمان کەی.

حاکم قسەی حەکیمی سەلماند و هەر ئەوکات بەشوێن مەلایەکی زانا و فەیلەسوفێکی گەورەیدا نارد وچۆنیەتی حاڵی خۆی بۆ بەیان و داوای یارمەتی لێکردن.

**مەلاگوتی:** باشترین دەرمان گۆرستانە، هەرکات قەڵس و نارەحەت بووی، هەلینگ دەگۆڕستان و وەبیر خۆتی بێنەوە کە ئەو دنیایە سەرەنجامەکەی مردن و لە ناو چوونە، ئەوکات بۆ خۆشی دنیا لە خۆ بایی نابی و بۆ ناخوشێکان خۆت بە مەراقانەوە ناخنکێنی.

**حاکم گوتی:** یرۆ بابە دەگەڵ دەرمانت، من وەختایەک ئاگام لە خۆم نییە چۆن دەتوانم غار دەمەگۆڕستان؟ شتێکی بڵی هاسان بێ.

**فەیلەسووف گوتی:** بە یرواى من تاقمێک لە زانایان لە دەوری خۆت بەهاڵێنە و لە قسەیان مەچۆدەر، ئەو زانایانە دەکاتی خەم و ناڕەحەتیدا دڵخۆشیت دە دەنەوە و دەکاتی خۆشی و لە خۆبایی بووندا ئامۆژگاریت دەکەن.

**حاکم گوتی:** یرۆ بابە، ئەگەر بریار بێ بە دەستوری ئەم و ئەو هەڵسورێم ئەدی حاکمایەتی من چ مانایەکی دەبێ؟

من بە کورتی قسەیەکم دەوێ، بنوسرێ و لە سەر نە قیمەی ئەنگوستیلەکەم جێی بێتەوە، هێندە پرمانا بێ بەلێروانینێک دەو پەڕی قەڵسی و نارەحەتیدا خاوم کاتەوە و دەو پەڕی خەم و پەژارە دا سێبوری بخاتە دڵم و لەو پەڕی لە خۆبایی بووندا وشیارم کاتەوە.

**مەلا وفەیلەسوف گوتیان:** دیتنەوەی قسەیەکی وا کورت و پر مانا کارێکی زۆر گرانە، باش وایە جەنابی حاکم دەستور بدا زانایان و قسەزانان کۆبنەوە و بەکتێباندا بگەڕێن وقسەی باشی زانایان دەرێنن و پێشنیاریان کەن و جەنابیشت قسەی پێویست لە نێویاندا هەڵبژێری.

حاکم ئەو پێشنیارەی بەکەیفێ بوو، دەماوەیەکی کورتدا، زانایان و قسەزانان بە ئەمری حاکم کۆبوونەوە وهەرکام لە بارەی سەبرولەسەرخۆییدا شێعرێک یا حەدیسێکیان گوت، بەڵام ویستی حاکم شتێکی دیکە بوو، هەموویانی پێ دور و درێژ بوون.

ئەو ڕۆژەکابرایەکی شڕۆڵی لادێیی کە بەهەڵکەوت ڕێی دە دەرک و بارەگای حاکم کەوتبووکاتێ دە مەسەلەکە گەیشت ئیزنی خواست تا ڕێی بدەن قسەی خۆی بکا.

**حاکم گوتی:** ئەگەر ئەوزانایانە بە تێکڕایی ئیزنیان لە سەر بێ من قسەیەکم نییە،زانایان و قسەزانان بەتێکڕایی هاواریان لێ بڵیندبوو: قوربان ئەوەچ فەرمایشێکە دەیفەرمووی؟ ئێمە تەواوی کتێبەکانمان سەنگ وسوژن داوە هەرچی قسەی باشە دەرمان هێناوە، بۆ ئێمە دەبێتەهۆی کە سری شان ئەگەر نەخوێندەوارێکی لادێیی لێرە نوتقێ بکا،

**کابرای لادێیی گوتی:** قسەکانی ئێوەم قبوڵە، بەڵام ئێوەکە تا ئێستا نەتانتوانیوە قسەیەک بەکەیفی حاکم بدۆزنەوە، ئیزن بدەن منیش قسەی خۆم بکەم ئەگەر بەکەیفێی بوو ئەوەباشە دەنا پێم پێبکەنن و بەڕێم کەنەوە، خۆ من نامەوێ بەشی کەس بخۆم، قسەیەکی دەکەم و دەڕۆم.

**حاکم گوتی:** زۆر حیسابی یە.

زانایان ناچار بوون دەبەرامبەر ویستی حاکمدا سەر بەردەنەوە،کابرا گوتی وەک دەقسەکانی ئێوەگەیشتم دەبێ ئەو قسەیە هێندەکورت بێ کە لەسەر نەقیمەی ئەنگوستیلە جێی بێتەوە، ئەگەر بەمن دەکەن لە سەر نەقیمەکە بنووسن ((ئەوەش دەڕوا)) حاکم بەدیتنی ئەو نوسراوەیە دەکاتی خۆشی و ناخۆشی و قەڵسی و نەخۆشی و... بە لێروانینێک دێتە سەر ئەو باوەڕە کە کاری دنیا دەحاڵی ئاڵوگۆڕ بون دایە و خەم خواردن و غەڕرە بوونی ناوێ و شیاوی دڵ پێ بەستن وخۆڵێگۆڕان نییە.

زانایان و قسەزانان هەستانە سەرپێ و هەرکەسەی ڕەخنەی خۆی گرت یەکیان گوتی: ئەو قسەیە تەنبەڵی دێنێ، ئەوی دی گوتی: ئەو قسەیەکۆن بووە و بەکاری ئەو دەوروزەمانەیە نایە.

**حاکم گوتی:** بە پێچەوانەی بۆچوونی ئێوە زۆر بەدڵمەوەنووسا، ئەگەر من دە هەموو کات دا ئەوەم لە بەرچاو بێ کەکاری دنیا دەحاڵی ئاڵ و گۆڕ بووندایە و هیچ شتێ وەک خۆی نامێنێ قەت بۆ هیچ شتێ خەم داناگرم و بەهیچ شتێ لە خۆبایی نابم پێم خۆشە ئێوەش ئەو قسەی قبوڵ کەن.

زانایان هەموویان بە مۆرەوە لە کابرای لادێیان ڕوانی و بڵاوەیان کرد.

حاکم دەستوریدا ئەنگوستیلەیەکی بۆ سازکەن و لەسەر نەقیمەی بنووسن ((ئەوەش دەڕوا)).

شێخ عەتتار ئەو حەکایەتەی دەئیلاهی نامەدا دەپازدە شێعردا گونجاندووە.

# دیاری

عەرەبێکی بیابانگەڕ تەواوی تەمەنی خۆی دەگەڵ ماڵ و منداڵی دەبیابانێکی وشک و بێروندا بردبوو سەرو هەرگیز ڕوی شار و ئاوەدانی نەدیبوو، ئاوی خواردنەوەشی لە تاڵاوێکەوە کە لە داوێنی تەپۆڵکێکە وە دەهاتە دەرو تۆزێک ئەولاتر عەرز قوتی دەداوە دابین دەبوو، خۆراکی خۆیو ماڵ و منداڵیشی زیاتر کوللە و گیاو گوڵی سەحرایی بوون.

لەپاڵ ئەو باریکە ئاوە پیرەدارێکی کۆنساڵی بێ بەرو میوە ڕووابوو، لە دورڕا سەوز دەچوو لە نزیکڕاتینی تاو هەڵیپروزاندبوو، ئاوەکە مەیلە و سوێر بوو دەهاویندا بەزەحمەت دەیانتوانی تونیەتی خۆیانی پێ بشکێنن لە وکاتەوەکە فامی کردبۆوە جێی لەوە خۆشتری نەدیبوو و لای وابوو ئەگەر لەوێ کۆچ کا و ماوەیەکی کورت لێی خافڵ بێ یەکێکی دیکە دەگاتێ و ئەو شوێنەخۆش ئاوو هەوایەی لێ داگیر دەکات.

وەختایەک ژیانی چەتوون و دژوار دەبوو لەمزڵەکەی دور دەکەوتەوە و لەسەر ڕێی کاروانچێکان دادەنیشت و شتێکی لەوان وەگیر دەکەوت و هەواڵێکی  دەپرسی و دەگەڕاوە، بەڵام لە بەختی ئەو، کاروانیش زۆر درەنگ درەنگ پەیدا دەبوون، تاوەکوو ویشکە ساڵێک داهات و ڕووی دەلایەک کردکە تا ئەوکات قەتی پێدا نەڕۆیشتبوو، هێندەڕۆیی و ڕۆیی تا تەواو لە ماڵ و مەئوای خۆی دوور کەوتەوە.

تووشی پیاوێک بووپرسی ئەو ڕێیە دەچێتەکوێ؟ ئایا لەو نزیکانەهیچ ئاوو  ئاوەدانییەکی لێیە؟

**ڕێبوار گوتی:** چەند فرسەخ پرۆی دەگەیە لێواری زێ یە، بەڵام بە ورێ یەی دیکە دا ئەگەر هەروا پرۆیو نەیپسێنێوە دەگەیە شار.

زۆری ئەو هەواڵە پێ خۆش بوو، ڕۆیی ڕۆیی تا بەسەرکەندە ڵانێکدا کەوت ئاوی بارانی تێداکۆ ببۆوە، چەند لقەدار و شیناوەردێکی کەم لە دەور و پشتی ئەوکەندەڵانە ڕوا بوون، ئەوکە دە درێژەی تەمەنیدا قەت ئەوەندەی ئاو لە جێیەک نەدیبووگوتی: دەڵێن زێ، کەوابێ زێ ئەوەیە.

عەڕەب هات و لە قەراغ زێ یە دانیشت. چەپۆکێکی ئاو بەچرو چاویدا کرد و خۆی فێنک کردەوە و هێندێکی خواردەوە، بەڵام نەخێر ئەو ئاوە لە و ئاوانە نەبوو کەتا ئەو کات خواردبوویەوە، بێ و نەبێ ئەوە ئاوی بەهەشتێیە، جا ئەگەر دەڵێن بەهەشتێک و حەوزی کەوسەرێک هەیە، راستیان گوتووە،هەن، بەڵام ئێمە بۆمان نەدۆزراونەوە.

دانیشت و بیری لە حاڵ و باڵی خۆی کردەوە وگوتی: مەشکەم پرلە ئاوکەم و بگەڕێمەوە ماڵ ئەوە هونەر نییە،من دەبێ بەو ئاوەی بەهەشت، سەرمایە یەک لەخۆشی و بەختەوەری هەمیشەیی وەدەست بێنم.

جاتوخوا حەیف نییە من لەو ئاوە بخۆمەوە وخەڵیفەی ئیسلام لێی بێ بەش بێ؟ واباشە مەشکەکەم لەو ئاوە پرکەم و بۆی بەرم، دەزانم قەتی ئەو چاکەیەی من لە بیر ناچێ، جا دیاری لە و ئاوە باشترکێ بۆی چووە؟

بێ ماتڵ بوون مەشکە وشک هەڵگەڕاوە کەی باش دەئاودا خوساند و پری کرد و زارکە کەی توند بەست و بەشانیدا داو ڕێگای شاری گرتە بەر وگەیشتە هەرکەس نیشانی ماڵی خەڵیفەی پرسی.

خوا و ڕاستان ئەو رۆژە خەڵیفە لە شار هاتبوو دەرو لە سەحرا چادری هەڵدابوو پێیان گوت: ئەگەر کارت بە خەڵیفەیە لەوەت باشتر بۆ هەڵناکەوێ، هۆو چادرەی دە سەحرادا هەڵدراوەچادری خەڵیفەیە، زۆری پێ خۆش بوو، شوکری خوای بەجێ هێناو یەک ڕاست ڕوی دەچادری خەڵیفەکرد، لە شکری و میرلە شکریان پێشیان پێگرت و پرسیان بۆکوێ؟

**زۆر دەخۆرادیوانەگوتی:** دەخلی بەسەر ئێوەوە نییە،من کارێکی گرینگم بە خەڵیفەیە و هەواڵێکی خۆشم بۆ هێناوە.

دەم و دەست بردیانە لای خەڵیفە.

خەڵیفە بەخێری هێنا و پرسی: چکارێکت هەیە؟

**گوتی:** کار؟ چت عەرز کەم، لە بەهەشت ڕا دیارییەکم بۆ هێناوی.

خەڵیفە بەسەر سوورماوی گوتی: لە بەهەشت ڕا؟!

**کابرا گوتی:** جا قوربان چت لێ نە شارمەوە، لە مەئوای من وشکەساڵی داهات و منیش بەشوێن ئاو و ئاوە دانیدا هەڵوەدا بووم، خواو ڕاستان هێندەگەڕام تا بە سەر بەهەشتدا کەوتم، هێندێکم لە ئاوی

بەهەشت خواردەوە، پێم تاوان و گوناهێکی گەورەبوو ماڵ و منالی من بەر لە جەنابی خەلیفە لەو ئاوە بخۆنەوە، هەر بۆیە مەشکەکەم لێ پڕکرد و بەر لە هەموو کەس بۆ تۆم هێناوە.

خەلیفەزانی کە میوانەکەی عەرەبێکی بیابانییە و دە درێژەی تەمەنیدا ئاوێکی ڕوون و سازگاری نەخواردووەتەوە، بەدڵێکی پاک و نیەتێکی چاکەوە لای وایە باشترین دیاری یەکە بۆ خەلیفەی هێناوە.

**فەرمووی:** جامێکیان بۆ هێنا و هێندێکی لە ئاوەکە تێکرد وخواردێوە، ئاوی باران بوو، بۆ لیمی لە دور ڕا دەهات.

کەخواردێوە فەرمووی: کەس کاری وا چاکی تا ئێستا نەکردووە، ئێمەش هیچ هەواڵێکمان لە بەهەشتی سەحرا نەبوو، چاکت کرد پێت ڕاگەیاندین و ئەو دیاری بە نرخ و نایابەت بۆ هێناین، ئێستا بڵی بزانم پێت خۆشە لەبەرامبەر ئەوچاکەیە دا چت بۆ فەراهەم کەین؟

**گوتی:** سڵامەتی خەلیفەبۆمن هەموو شتێکە، دەبێ خەلیفە لێم ببورێ ئەگەر وشترم بایە، باری وشترەکەم لەو ئاوە بۆ دێنای، ئێستاش منالەکانم چاوەڕوانن، داوام ئەوەیە: ئیزن بفرمووی بگەڕێمەوە لایان.

خەلیفە چەند دلۆپەئاوێک کەدەجامەکەدا مابوو بەجوانی دە مەشکەکە ی کردەوە و زارکەکەی توند بەست و دایە دەستی یەکێک لە نزیکانی و ڕایسپارد لە جێگایەکی باشی دانێت و زۆر چاکی ئاگاداری لێ بکا ئە وکات دەستووری دا وشترێک و دوو مەشکەو کیسە پوڵێک و نان و خورمایەکی زۆریان بۆ هێنا و دای بەکابرا و گوتی: ئەوە پاداشتی ئەوخزمەتەیەکە بەئێمەت کردووە، بەڵام مەرجی هەیە، ئەویش ئەوەیە: هەر ئێستا سواری وشترەکەت بی و بێ ئەوەی بۆلای شار بچی یەکڕاست بگەرێیەوە لای ماڵ و منداڵت و تادەتوانی لە بەهەشتەکەت کەلک وەرگری و بەکەسی نیشان نەدەی.

عەرەب، جایزەی خۆی وەرگرت و دوعای زۆری بۆ خەلیفەکرد و بە هەمان رێدا کە هاتبوو گەڕاوە.

وەختایەک عەرەب ڕۆیی، یەکێ لە نزیکانی خەلیفە گوتی: وادیارە ئەو پیاوە دە درێژەی تەمەنیدا ئاوی لەو ئاوەڕوونتر وخاوێنتری نەخواردووەتەوە، نازانم بۆچی بەرگریتان لێکرد و نە تانهێشت بچێتەشار؟ ئەگەر چووبا بە دڵنیایی هێندێک چاووگوێی دەکراوە و دنیای باشتر دەناسی.

**خەڵیفەگوتی:** بە پێچەوانە، ئاوا زۆر باشتر بوو، ئەو پیاوە بەهێنانی ئەو مەشکە ئاوە پێی وایەگەورەترین کاری بۆ ئێمە ئەنجام داوە، ئەگەر چوبا شار و ئەو هەموو ئاوەی شەتێی دیبا، نازانن بێچارەیە چەندە بەخۆیدا دەشکاوە! لام وایە ئەگەر تەواوی دنیامان دابایە نەماندە توانی دڵی چاکەینەوە، هەرچی کردم نەمتوانی بەچونە شارێک ئەو دڵخۆشی یەی تێیدا بەدی هاتبوو لێی بستێنمەوە، من دە بەرامبەر چاکەیەک کە دەگەڵمی کردبوو چاکەم لە گەڵ کردەوە ئەو دیاری یەش لە گەڵ ڕاددەی تێگەیشتنی ئەودا دەهاتەوە، ئاخر برایان قبوڵ کردنی دیاریش بۆخۆی ڕێ و رەسمی تایبەت بەخۆی هەیە، لێی گەڕێن با تا ماوەیەکی زۆر بەو خزمەتەی کەکردویەتی دڵخۆش بێ.

مەلەویش لە مەسنەویدا حەکایەتێکی لە بارەی خاجە نیزامولـمولکدا بەشێعر گوتووەکە دەگەڵ ئەو ڕوداوە نزیکایەتی هەیە.

باغەوانێک سێ دەنک هارۆێی شلک و تازەی لە کاتی نۆبەرەدا بەدیاری بۆ خاجە هێنا، خاجە هارۆێیەکی چاکرد وخواردی و لە خۆشیان سەری ڕاوەشاند، هارۆێی دووهەمی و سێهەمیشی بەو جورە خوارد و فەرمووی کەسی نەکرد، لە پاشان باغەوانی خەڵات کرد و بەدڵخۆشی ڕەوانەی کردەوە، پاش رۆیشتنی باغەوان خاجە ڕووی دە دەست و پێوەندان و هاوڕێیانی کرد وگوتی: یەکەم هارۆێم کەخوارد، تاڵ بوو، دوهەمیم پا کرد، بەو تەمایەی ئەگەر تاڵ نەبێ فەرمووی ئێوەی بکەم، بەداخەوە ئەویش هەر تاڵ بوو، سێهەمیم پاکرد، لەهەموویان تاڵتر بوو، ئەگەر نەم خواردبان جۆرە بێحورمەتییەک دەبوو بەباغەوان، ئەگەر دابام بەئێوە و خوا نەخواستە یەکێکتان تاڵی هارۆێکانتان ئاشکرا کردبا باغەوان بەخۆدا دەشکاوە.

شێوەی ئەو داستانە دە بەسەر هاتەکانی لوقمانی حەکیم دایە.

# فڕوفیشاڵ

حەزرەتی سولەیمان بە خۆیوو لەشکریانێوە بەسەحرایەکدا ڕادە بردن، دەوسەحراپان و بەرینەدا، باڵندەکان لە سەر داران و گیان لە بەڕانی دیکە لەسەر زەوی خەریکی ژیان و ڕابواردنی خۆیان بوون، پۆلێک چۆلەکەش لە سەر دارێک کۆببوونەوە و ئەو چڵ ئەو چڵیان دەکرد، بەڵام لە م نێوەدا دوو چۆلەکەی جحێڵ کە تازە پێکەوە جووت ببوون و زەماوەندیان کردبوو بەتاقەوە لەسەر لقێک نیشتبوون و گەرمی قسەی خۆیان بوون، چۆلەکەی مێیەگوتی: دایڕوانە، ئەرێ ئەوە سولەیمان نییە دەگەڵ لەشکریانی بەو دەشتەدا ڕادە برێ؟

**چۆلەکەی نێرەگوتی:** با، بۆخۆیەتی، جا بە ئێمەچی؟ با لەوان گەڕێین و باسی خۆمان بکەین.

((با) کە دەژێر فەرمانی سولەیمان دا بوو، قسەو سرت و خورتی ئەوانی بەگوێی سولەیمان ڕاگەیاند.

سولەیمان کە ناوی خۆی دەنێو ئەووت و وێژە دا بیست بە وردی گوێی بۆ قسەی ئەو دوو چۆلەکەیە هەڵخست.

**چۆلەکەی مێیەگوتی:** چاو لێکە ئەودام و دەزگایەی! ئەو بەرگ و لیباس و ئەسپانەی! بەڕاستی خۆشی رادە بوێرن.

**چۆلەکەی نێرەگوتی:** خۆشتر لەوان ئێمەین کەلێرە پێکەوەین و دوو بە دووین و کەس نازانێ کەچەندە دڵخۆشین.

**مێیەگوتی:** راستە، ئێمە دڵخۆشین، بەڵام مەبەستی من ئەوەیە بزانی ئەو دنیایە چەندی شتی جوان و چاک تێدایە.

**نێرەگوتی:** بەڵی زۆر شتی تێدایە و ئێمەش هەموو شتێکمان هەیە بەختەوەرین و هیچ کەم و کەسری یەکمان نییە.

**مێیەگوتی:** راستە ئێمە بەختەوەرین، بەڵام ژیانی ئێمە دەبەراورد دەگەڵ ژیانی ئەوانە دا لێک جیاوازە، کەم و کەسریش ئەگەر بڵێی نییە، هەیە، بۆ نموونە ئێمە قالیچەی سولەیمانمان نییە بەڵام ئەو هەیەتی.

**نێره بەناڕەحەتییەوەگوتی:** هی! قالیچە! قالیچە هێندێک بەن و ڕیسە، چنیویانەو نێویان ناوەقالیچەی سولەیمان، لەسەری دادە نیشێ و پێی دەچێتە جێگایان و دایم و دەرهەم ترس و دڵەکوتەیەتی کە نەکا لە سەرێ ڕا بەربێتەوە خوار، بەڵام ئێمە بەو باڵە سووک و نەخشینانەمانەوە بو هەرکوێ حەزکەین دەفڕین وبۆ هەرجێیەک کە پێمان خۆش بێ دەچین.

باوەڕکە ئەو ژیانەی ئێمە دەستمان پێکردووە زۆر زۆر لە ژیانی وانە خۆشترە، با یرۆینە سەر هۆو لقەی سەرەوە، لەوێوە وڵاتمان باشتر لێرا دیارە.

**مێیەگوتی:** زۆر باشە. با باڵی ئێم لەقالیچەکەی ئەو باشتر بێ، ئەی بۆ خواردە مەنییەکانیان دەڵێی چی؟

**نێرەگوتی:** هی! خواردەمەنیکانیان! ئەوە ئیدی هەر بۆ باسکردنێ نابێ.

ئێمەکامەترێی جوانەگوڵبژێری دەکەین و دەیخۆین، کە چی ئەوان یا بە ڕزیوی یا بە ئیشکی دەیخۆن ناوەکەی دەگۆڕن و کشمیش ومێوژی پێدەڵێن، ئێمە برینج و گەنم و دانەوێڵەکانی دیکە هێشتا فەریک و ئاودارن دەیانخۆین، بەڵام ئەوان هەتا دەعە مباردا نەڕزێن و برشی نەهێنن ئیشتیایان نابا بیانخۆن.

**مێیەگوتی:** خۆ خواردن هەر دانەوێڵە نییە، ئەوان نانە شەکرەیان هەیە پەنیریان هەیە، پەڕی تاوس دەسەریان دەچەقێنن وئەو ملوانکە جوانانەیان دەمل دایە.

نێرە بەو قسانە تەواو تورە بوو گوتی: زۆر باشە، هەرچی تۆ بتەوێ من بۆتی ئامادە دەکەم و ناهێڵم قەت توشی کە مایەسێ بی، زۆر لە سولەیمان خۆشتری رادە بوێرین تازە لەهەمووی گرینگتر بەس نییە ئێمە لە سولەیمان بە هێزترین، بۆ نموونە ئەگەر بێت و رۆژێک لەگەڵ سولەیمان دڵ ئێشاوییەکمان لێ پەیدا بێ و کڵاومان دەبەرێک بگیرێ، تاقە پێلاقەیەک کیفایەتە لە قوببەو تەخت و بارەگای دەم بەجارێ هەمووی بە سەر یەکدا دەڕوخێنم.

دەوکاتەدا دەستەیەک چۆلەکە هاتنە سەر ئەو لقەی ئەوانی لە سەر بوون، ناچار قسەکانیان یرێوە، بەڵام سولەیمان ئەو قسانەی بە تەواوی

بیست،کاتێ گەیشتەوە ماڵ، فەرمانی دا بڕۆن لە فڵانە سەحرا، فڵانە چۆلەکەی بێنن.

زۆری پێ نەچوو، چۆلەکەی نێریان لە بەر دمی سولەیمان حازر کرد.

**سولەیمان پرسی:** ئەو قسانە چبوون دەتکردن؟

چۆلەکە ترسا و وەپتەپت کەوت،قوربان من! من! من چۆلەکەی تۆم بێ ئەدەبی یەک لە لایەن منەوە ڕوی نەداوە، ئامادەم گیانی خۆم لە پێناوتدا بەخت کەم.

سولەیمان دەستی درێژ کرد، لەو قاپەی لە پێشی بو دانکە بادامێکی دەرێنا و هاویشتێ سەرعەرز و گوتی: تۆکە ناتوانی ئەو دانکە بادامە بشکێنی، چۆن دەتوانی بە پێلاقەیەک تەخت و بارەگامان بە سەردا بروخێنی؟ ئاخرگیانەکەم، ڕووحەکەم، خۆ هەڵکێشانیش ئەندازەی هەیە، ئەگەر لە حیسابی خۆی لادا دەبێتە فڕوفیشاڵ.

تۆ بەوقسانە دەتەوێ ئیعتباری ئێمەکەم کەیەوە، نارەحەتیم لە بەر قسەی تۆ نییە، لە وەی قەڵسم تۆ بەو بچوکییەی خۆتەوە ئەو قسانە بکەی، دەبێ شێر و پڵینگ و فیل چ بڵێن، ئەی ئینسانەکان؟! لات وانییەکە ئەو قسانە پێچەوانەی حەیا و ئەدەبن؟

چۆلەکە، کەدیتی شێوەقسەکردنی سولەیمان هێدی و ئارام و باوکانەیە، تۆزێک غیرەتی هاتەوەبەروگوتی: قوربان حەق بەتۆیە، بەڵام خۆمن خەریکی لەشکرکێشی لەجەنابت نەبووم، ئەوەی دەمگووت جاڕم نەدەکێشا، خەریکی ووت و وێژ لەگەڵ هاوسەر و شەریکی ژیانی خۆم بووم، دەمەویست لێهاتوویی و ئازایەتی خۆمی پێ بسەلمێنم، سەرەتای ژیانی ژن ومێردایەتی هەمیشەتێکەڵاوی ئەو جورەفڕوفیشاڵانەیەو دەکردنی ئەو قسانەدا مەبەستم بێ ئەدەبی کردن بەجەنابت نەبووە.

خوایەچبکەم؟ چۆن بڵێم دەوێم کردووە؟ ئەوەچ قسەیەک بوو کردم؟

**سولەیمان بەو قسانەی چۆلەکەپێکەنی و گوتی:** قەیدێ ناکا، بڕۆ ئەوجار هیچ؛ بەڵام لەمەو بەدوا وشیار بەهەر قسەیەکت کرد دەپێشدا بیری لێ بکەوەو قەت کار و قسەیەکی وا مەکەکەلەپاشان ناچار بی وا بەکەنەفتی و لارەملی داوای لێبوردن و چاوپۆشی لێکردن بکەی.

# شێتی قامیش‌سوار

ڕۆژێک لەناکاو خەڵکی شار چاویان بەکابرایەک کەوت سواری قامیشێک ببوو، وەک ئەسپی ڕاستی دەنگی دەدا! ڕکێفی لێدەدا و دەیحیلاند و قاقای دەکێشا، بێ ئەوەی هیچ حەمیەتێک بەدەورو بەری بدا، بەدەوری مەیدانی شاردا غارێن و ڕمبازێنی دەکرد! منداڵان لەدوورا قامکیان بۆ ڕادەداشت و دەیانگوت: چاچاو بێچارەیە نهوومی سەرێی بەکرێ داوە.

خەڵک ئەو پیاوەیان دەناسی، پیاوێکی بێدەنگ و بێ قسەو باس و تا بڵێی ماقوڵ بوو، هەموو بە بنیادەمێکی ئاساییان دەناسی، کەچی ئەو ڕۆژە گوتیان: شێتە.

کاتێ شێتەچەند جار بەدەوری مەیدان دا هات و سەرقاڵی کاری خۆی بوو، پیرە پیاوێک بانگی کرد و پرسی:

- بۆخۆشت دەزانی چدەکەی؟!

- جا ئەوەپرسینی ناوێ، ئاشکرایە، خەریکی ڕمبازێنم.

**کابرا سەرێکی ڕاوەشاند و گوتی:** ڕمبازێن بەئەسپ دەکرێ، ئەوەی سواری بووی ئەسپ نییە! قامیشە!

**شێتەگوتی:** جا بەتۆچی ئەسپەیا قامیشە؟ کەس نییەبپرسێ کەبەچ حەققێک خۆ دەکاری من هەڵدەقوتێنی؟ مەگەر ئەو کارەی من دەیکەم زەرەرێکی بۆ تۆ هەیە؟

- نەخێر زەرەری بۆ من نییە، ئەگەر زەرەرت پێگەیاندبام دەچووم شکایەتم لێدەکردی، بەڵام ئەوەی تۆ دەیکەی کارێکی شێتانەیە، تەنیا دەمەویست لەوەندەت حاڵی کەم کەکارەکەت وەک بنیادەمی تێگەیشتوو ناچێ.

**شێت گوتی:** بڵی بزانم ئینسانی تێگەیشتوو چکارێک دەکا کەشێتانە نییەو بەپروای تۆ ژیرانەیە؟

**کابرا گوتی:** ئاشکرایە، ئینسانی ژیر ئەرکی خۆی بەجێ دێنێ، بەئەندازی توانایی خۆی کار دەکا و پێداویستی ژیانی دابین دەکا و پاشان دەحەسێتەوە دوایەبەعیبادەت و کتێب خوێندنەوە و کاری بەڕێوجێ ڕایدەبوێرێ.

**شێتەگوتی:** دەی وەختایەک ئینسانی ژیر ئەو کارانەی گوتت هەمووی ئەنجام دا، ناتوانێ هێندێک بگەڕێ و بەکەیفی دڵی خۆی رایبوێری؟

**کابرا گوتی:** بۆ ناتوانێ؟ ئینسان وەختایەک توانی هەموو کارەکانی ئەنجام دا و لێبۆوە، دەتوانێ بەسەدان کاری دیکەکەزیانی بۆ خۆی و خەڵک نەبێ و ژیرانەبێ، بخافڵی.

**شێتەگوتی:** دیسان کوتتەوە ژیرانە! تۆ بڵێ بزانم ئەگەرکەسێک سواری ئەسپی پێ خۆش بێ و لەجێیەک بەردەستی کەس نەگرێ، خەریکی ڕمبازێن بێ و دڵی خۆی بەو کارەخۆش کا، ئایا کارێکی خراپی کردووە؟

**کابرا گوتی:** نەخێر، ئەسپ‌سواری بۆ کەسێک کەپێی خۆش‌بێ زۆر شتێکی باشە،بەڵام بۆ خۆت باش دەزانی ئەسپ‌سواری و قامیش‌سواری تەفاوەتیان بە ئەندازەی نێوانی ئەرز و ئاســمانە.

**شێتەگوتی:** چ جیاوازییەکیان هەیە؟

**پیاوەکەگوتی:** بەڕاستی سەیری! جا چۆن جیاوازییان نییە؟! کورەکابرا وادیارەبەڕاستی شێتی!

**شێتەگوتی:** هیچ شێت نیم، ئەسپ‌سواری و قامیش‌سواری هەروەکوو یەکن یەکەو دوای ئەوە، ئەگەر من سواری ئەسپیش بووبام هەر ئەوەندەی ئێستا دڵم بەو کارەخۆشە، ئەو کاتیش هەر ئەوەندەدڵخۆش دەبووم.

ئەگەر ڕاستییەکەت بوێ، تۆ بەغیلی و چاوت بەخۆشی من هەڵنایە.

**پیاوەکەگوتی:** نا بابەکەم! خراپ حاڵی بووی، من بەغیل نیم، بەڵام تۆ لەجیاتی ئەوەی سواری قامیش بی سواری ئەسپ بە، با خەڵک نەڵێن شێتی.

**شێتەگوتی:** ئیدی ئەوەخەتای من نییە، ئەوانەی گاڵتەبەمن دەکەن یا بۆخۆیان ئەسپیان هەیەیا ئەوەی حەز لەسواری ئەسپ ناکەن و دەیانەوێ بەگاڵتەکردن بەمن خۆیان ژیر و تێگەیشتوو نیشان بدەن.

من سواری ئەسپم پێ خۆشە، بەڵام ئەسپم نییە، ئیدی خۆم بەو نەبوونەوەناخنکێنم، سواری قامیشی خۆم دەبم و منەتی کەس هەڵناگرم و لەمن وایەئەسپی حدودم دەبندایە، ئەو کارەشم زەرەری بۆ هیچ کەس نییە، ئێرەمەیدانی گەورەی شارەو جێی هەموو کەس دەبێتەوەو منیش لێرەخەریکی ڕمبازێنی خۆمم، بەڵێ ئەگەر هاتبام لەبن دیواری تۆ ملم لەتەپەتەپێ نابا، ئەو وەخت حەقت بوودەنگم بدەی، چاویان لێکەئەو خەڵکەچۆن تێم ڕاماون و بزەیان لەسەر لێوە! دڵنیام ئەگەر سواری ئەسپێکی راستی بووبایەم، بەدیتنم قەت ئەوەندەیان کەیف ساز نەدەبوو.

ئێستاش من ئیزنی ئەوەبەخۆم نادەم بۆ شتێک کەدەتواناییمردا نییەو بۆم هەڵناسووڕێ خەمێ بخۆم، سواریم پێ خۆشەو ئەسپی منیش جارێ ئەوەیە، تەواوی کارەکانی خۆم جێ بەجێ کردووە، نیو سەعاتم وەختە سواری خۆمی بۆ دەکەم و وەڕەزی خۆم دەشکێنم و دەڕۆمەوە، شێتیش ئەو کەسەیەکەنانی خۆی دەخوا و خۆی زەحمەت دەدا تاوەکوو ئەو خۆشییەی تێیدام لێمی بستێنێ، تۆ ئەگەر کارێکی ژیرانەت پێ شک دێ پرۆ بیکەبا بەشێتت نەزانن.

شێتەئەوەی گوت و ئەسپەکەی دەنگ دا: هەی! هەی! و بەدڵخۆشی سەر لەنوێ ڕکێفی لێداوە.

کابرا سەرێکی ڕاوەشاند و لەبەرەخۆیەوەبۆڵاندی: پەککو، بۆو بێچارەیە، شێت بووە، دەژێر باری قورسی ژیاندا تاقەتی نەهێناوە چبکا؟ لەکەڵڵەی داوە.

# بەرداش

هەروەک دەزانن شێخ ئەبوسەعید دەروێشێکی دڵڕوونی دەرون پاک و لە نەیشابوور خانەقایەکی بوو، مریدان و شاگردان لێی هاڵابوون، رۆژێک شێخ دەگەڵ تاقمێک لەدەروێشان بەسەحرایەکدا ڕادەبردن، گەیشتنەئاشێک، ئاشەکەئاشی ئاو بوو، ئاوی سەرچاوە بەدۆڵاشدا دەڕۆیشتە ژورو لەپەڕەی ئاشی دەدا و سەر بەرد دەسوڕاو بن بەرد گەنم و جۆی لێکراوی دەداوەدەرێ.

شێخ ئەبو سەعید دەبەرگی دەروێشیدا وەژور کەوت و سڵاوی کرد و دەستی بەتەماشاکردنێ کرد.

ئاشەوان چوار پێنج مشتەری بەڕێکرد، بەڵام ئەبوسەعید هەروا خەریکی ڕوانینێ بوو، یەکێ لەمشتەرییەکان کەدیتی شێخ لەتەماشاکردن وەڕەز نابێ بەسرتە بە ئاشەوانی گوت: چاو لەو دەروێشەکە دەڵێی قەت ئاشی نەدیوە! ئاشەوان گوتی: نا، من ئەوانە دەناسم، دەهەموو شتێک ئاوا بەسەرنجەوە دەڕوانن و پەندێکی لێ وەردەگرن، چت پێداوەبا بەکەیفی خۆی چاو لێکات؟

**مشتەرییەکی دیکە گوتی:** بەڵام وادیارە دەگری، بێچارەیەڕەنگەوەبزانێ ئەو بەردە بەموعجیزە دەسورێ، کەوتووەتە یادی خووا.

**یەکێکی دیکەگوتی:** نا بابە دەروێش و سواڵکەر و چاو لەدەستە چاوەڕێیە یەکێک بەخێرا خۆی مستەئاردێکی بداتێ.

بەڵام ئەبو سەعید هیچ گوێی نەدەدانێ و دەفکری خۆیدا بوو فرمێسک هەروا میوانی سەرگۆنای بوو، بەچاوی سەرنجەوە لەئاش و دۆڵاش و بەرداشی دەڕوانی.

شێخ زۆری پێچوو هاورێیانی بەدوایدا هاتنەژور و لێی هاڵان و یەکێکیان گوتی وادیارەجەنابی شێخ سەیری ئاشی زۆر پێخۆشە؟ مشتەرێکان چاوەڕوانی وە ڵامی شێخ بوون، شێخ گوتی: تەماشای ئاشم پێخۆشەیا نا، ئەوەشتێک نییە، بەڵام ئامۆژگاری ئەو

بەرداشەسەرنجی منی ڕاکێشاوە، ئەو بەردەقسان دەکا، دەمدوێنێ، دەزانن دەڵێ چی؟

**مریدان گوتیان:** تۆ باشتر دەزانی.

**ئەبوسەعید گوتی:** ئەو بەرداشەدەڵێ: لەخۆڕا ناوی خۆت ناوە دەروێش و دڵت بەوە خۆشەکە دڵڕون و دەرون پاکی و بەدنیادا دەگەڕێی تا تێبگەی و تێبگەیێنی، بەڵام ئەوەی بزانە دەروێشی دڵرونی دەرونپاک منم، هەرچەند پێم دەکۆت و زنجیر دایە بەڵام بەهەرگەڕێکم قازانجێک بەخەڵک دەگەیێنم.

تۆ پێت وایەبەرگی زۆر بکەیەبەرت نیشانەی پیاو چاکیتە، بەڵام منی ڕوت و قووت دەنکی درشت و زور وەردەگرم و ئاردی نەرم و نۆڵ دەبەخشــمەوە، تۆ پێت وایەکەدەبێ بەتەواوی جیهاندا بگەڕێی ئەوکات تێبگەی، بەڵام من لەجێی خۆم چەقیوم و دەزۆرشتان گەیشتووم، تۆ پێت وایەچونکی هەموو شتێک نازانی دەبێ سەرگەردان بی و لێرو لەوێ خراپەی خەڵک و دنیایەبڵێی، بەڵام من بەئەندازەی لێهاتوویی و توانایيم ئەرکی خۆم ئەنجام دەدەم و باسی کەس ناکەم، تۆ پێت وایەهەرکەس ڕدێنی دەئاشدا سپی کردبێ هیچ نازانێ بەڵام من دەزانم گوزەری ژیان ڕدێنی زۆرکەسان سپی دەکا و هیچ کامیان بەئەندازەی ئەو ئاشەوانە دەژیان ناگەن، تۆ هەر چەند خۆت پێ باشەو بەپرِوای خۆت  ویستەکانی دنیات وەلا ناوە، بەڵام لەباتی ئەو شتانەی لەخەڵکیان وەردەگری هیچیان نادەیەوە، کەچی من کەبەرداشێکی بێ قابیلی ئاشم و هیچ داوایەکم نییە، هەرچی لێیان وەرگرم، باشتریان دەدەمەوە، تەنانەت بەئەندازەی نوکە دەرزییەک حەقی کەس بەلای خۆمەوە ڕاناگرم.

بەو قسانەی کەبەرداش دەیانکا من زگم بەخۆم دەسوتێ، دەزانم ڕاست دەکا  هی ئێمە پاکی خۆ هەڵکێشانە، بەڵام هی ئەو هونەرە، هی ئێمەقسەیەو ئی ئەو کردەوەیە، ئێمەبێکارین و ئەو دەکاردایە، ئێمەلە ونبوویەک دەگەڕێین بەڵام ئەو ونبووی خۆی دۆزیوەتەوە، ئێمەهەموو دەرێگادایین بەڵام ئەوگەیشتۆتە مەخسەد.

گۆناوچاوی شێخ بەرێژنەی فرمێسک خوسا بوو هاورێیانیشی بەو قسانەمات و چووبوون دەفکرەوە، بەڵام مشتەرێکان هەر هیچی لێ تێ نەگەیشتن.

**یەکێک لەوان لە ئاشەوانی پرسی:** هیچ تێدەگەی مەبەستی وانەچییە؟

**ئاشەوان گوتی:** هەر وەک گوتم، ئەوانە تاقمێک دەروێشی دڵڕونی دەرون پاکن، هەموو شتێک دەبینن و لەبارەیاندا دەدوێن، شیرنزمان و مەشرەف خۆشن، دەهەر شتێکدا لە نهێنییەک دەگەڕێن و نوکتەیەکی بۆ دەڵێن، دەگرین، پێدەکەنن، ئامۆژگاری خەڵک دەکەن، زۆرجار قسەکانیان وەڕاست دەگەڕێ، بەڵام خەمێ مەخۆ چونکی سەرەپەتکی ئەودنیایە دە دەست ئێمە دایە، ئێمەین گەنم و جۆ دەکەینەئارد و ژیانی خەڵک دابین دەکەین.

دەدنیادا پیاوچاکبوون زۆر باشە بەڵام ئەگەر پیاوانی کار دە مەیدانی هەوڵ وتێکۆشاندا نەبن، کاری دنیا لەنگە.

# ڕدێنی عابید

لەزەمانی حەزرەتی موسا، عابیدێک لەدنیا و خەڵک تەریک و تاک و تەنیا لە گۆشەی ئەشکەوتێک شەو و ڕۆژ خەریکی زیکر و عیبادەت وکڕنۆش بۆ بارەگای باری تەعالا بوو، بەڵام ئەو جورەی پێویست بوو بەو عیبادەتە ئۆخژنی نەدەهاتێ و سوکنایی نەدەکەوتە دڵ.

جارو بار دەچوو دەفکرەوە، دەستی بەڕدێنەکۆرپەکەیدا دێناو بەشانەی دەکرد و دەیگوت: تۆ بڵێی خوا ئەو نوێژ و تاعەتانەی تا ئێستا کردوومن قبوڵی کردبن؟ تۆ بڵێی دەنگم گەیشتبێتەبارەگای؟

تاکوو ڕۆژێک توشی حەزرەتی موسا هات و لەبەری پاڕاوە: هەرکات ڕۆیشتەسەر کێوی توور بۆی لەباری تەعالا بپرسێ کەداخوا بۆچی ئەو بەو هەموو نوێژ و تاعەتەیەوە کە دەیکا، سوکنایی ناکەوێتە دڵ و ئۆخژنی نایەتێ؟

کاتێ موسا ڕۆیشتە سەر کێوی توور و هەزار و یەک کەلیمەی عەرزی بینایی چاوان کرد، لەحاڵ و چۆنیەتی ژیانی ئەو عابیدەی پرسی.

نیدا و سروشی غەیبی فەرمووی: ئەی موسا ئەو پیاوە لەسەر دیمەن و ڕواڵەتی پیاو چاکانە، لە خەڵک هەڵبڕاوەو خەریکی زیکر و عیبادەتە، بەڵام بەداخەوەفکر و بیری بەلای ئێمەوە نییە، هەموو جاران کەسەر دەخاتە سوژدە، فکری لای ئەوەیە بزانێ چڵێک لەو ڕدێنە زل و پانەی وەعەرز دەکەوێ یا نا؟

کاتێ کەسێک دەچێتەسەردانی بەر لەهەموو شتێ بیر لەوە دەکاتەوە ئاخۆ ڕدێنەکەی دەکەوێتە بەر پەسەندی ئەو میوانەیا نا؟

کاتێ چاو لەئاوێنەدەکا، بۆ ئەو چاوەڕون و ساغانەی کەپێمان داوەشوکرانە بژێر نییە، بەڵام فکر و هۆشي دەکەوێتەسەر ڕدێنەکەی کەبۆخۆی ئاگاداری لێکردووەو بەو شکڵ و شێوەی دەرێناوە.

ئەوەچ جیاوازییەکی هەیە دەگەڵ ئەو کەسانەی کەبوتێکی دنیایی جا چ پوڵ یا پلەو پایە بۆ خۆیان دادەتاشن، ئەو کە زیکری بۆ ئێمەو فکری

بەلای ڕدێنەکەیەوە، هەرگیز بەو جورە عیبادەتەسوکنایی ناکەوێتەدڵ و دەرونی و ئەوپەڕی عیبادەتەکەی دەگاتە ئەو شوێنەی کەفکری لێیەتی.

کاتێ موسا لەکێوی توورا گەڕاوە، عابیدی تێگەیاند کەدەکاتی عیبادەتدا ئەوەندەی هۆشی بەلای ڕدێنێوەیە ئەوەندەی هۆش بەلای خواوەنییە.

کاتێ عابید ئەو راستییەی بیست، بەشەرمەزاری و شڵەژاوی ملی نا لەگریان و گوتی: راستە، هەرچەند جاری کەلەبەر خوا دەپاڕامەوە هۆشم بەلای پاڕانەوەکەم نەبوو، سەرنجم لەسەر ئەوەبوو لەکاتی پاڕانەوەدا ڕدێنم چۆن دەجوڵێتەوە؟ بەداخەوە ئەو خۆپەرەستی یە قەت نەیهێشت بەتەواوی بیر و هۆشم بەلای خواوەبێ.

لەپاشان هێندەناڕەحەت بوو، دەحاڵێکدا کەهۆڕهۆڕ دەگریا، لەداخان دەستی دەڕدێنی ناو چڵ چڵ خەریکی هەڵقەندنەوەی بوو هاواری دەکرد: نامەوێ ئەو ڕدێنەم ناوێ، هەموو خەتای ئەو ڕدێنەیە، نامەوێ... نامەوێ.

موسا تەواو لەپەرێشانی و پەشیمانی کابرای عابید چۆ دەفکرەوە، کەدیسان نیدای بۆ هات: کەئەی موسا دیتوتە؟ ئەو کابرایەکەئێستا دەدەردی خۆی گەیشتووە، هێشتاش واز ناهێنێ و دەسبەرداری ڕدێنی نابێ، جاران بەردەوام دەفکری ڕازاندنەوەو جوان ڕاگرتنی دابوو، ئێستاش دەفکری هەڵقەندنەوەی دایە خۆ ڕدێن تاوانێکی نییە، تاوان، تاوانی فکر و هۆشی خۆیەتی، زۆرکەس ڕدێنیان هەیەبەڵام هیچ دەفکریدا نین، بەڵکوو دەفکری ئەو کارانەدان کەبۆیان دیاری کراوە.

ئەوانەی بەدایم دەبیری ڕازاندنەوەی لە رادده بەدەری دیمەن و ڕواڵەتی خۆیان دان، بەشی زۆریان دەناوەرۆکدا بۆش و گەندەڵ و عەیبدارن.

# وەفا

دەو زەمانیدا کەشەڕی کافر و موسوڵمانان دەئارادا بوو پێیان دەگوت غەزا کافر و موسوڵمانێک دەمەیدانی شەڕی تەن بەتەن و ململانێدا دەگژ یەک ڕۆهاتبوون و کەڵلەیان لەکەڵلەی یەکتر دەدا.

کاتی بانگدان، موسوڵمانەکەئیزنی لەکافرەکەخواست نوێژەکەی بکا ئەو کات درێژە بە شەڕەکەیان بدەنەوە، کافرەکە ئەمانی داو، موسوڵمان نوێژ و حەمد و پاڕانەوەی خۆی لەقاپی خوا بەجێ گەیاند.

کافرەکە هەر وا ڕاوەستا بوو، پاش ئەوەی کابرای موسوڵمان لەنوێژ بۆوە، دەکاتی پێویست داکابرای کافریش ئیزنی خواست دەرفەتی بدا تا ئەوەیش عیبادەتی خۆی بەجێ بێنێ، موسوڵمانەکەش ئیزنی دا.

کابرای کافر بوتەکەی لەباغەڵی هێنا دەر و لەپێش خۆی دانا و کڕنۆشی بۆ برد و لەبەڕامبەریدا ملی نا لە پاڕانەوە، دەو کاتەدا کەکابرای کافر سەرقاڵی پاڕانەوەی خۆی بوو، موسوڵمانەکەبەدڵیدا هات: وەختی چاکە ئێستا هیچ ئاگای لەخۆی نییە، لەپشتەوەڕا شیرێکی لەتەپڵی سەری دەدەم و حەیاتی لێ دەبڕم.

خەریک بوو ئەو کارەبکا، کەدەنگێکی دەرونی ویژدانی نوستووی وەخەبەر هێنا: ئای ناموسوڵمان، ئەو کافرەبەو هەموو کافرێتی و دڵڕەشییەی خۆیەوە پیاوانە مۆڵەتی دای و هیچی لێ نەکردی، ئێستا تۆ خەریکی هەموو ڕەسم و یاسای مەردان بخەیەژێر پێ؟ تۆ دەبێ شەرم بکەی لەو فکرەت و داپرزێی.

کابرا بەو دەنگەدەستی شل بۆوە شیر و تیری بۆلایەک هەڵداشت و ملی نا لەگریان و پاڕانەوە: کابرای کافر ئەو حاڵەی پێ سەیر بوو پرسی: ئەی کابرا بۆ دەگری؟ بۆ دەبارێنی؟ بۆ وازت لەشەڕ هێنا؟

کابرا چۆنیەتی بۆ گێراوەو گوتی: لەبەر تۆ کەوتمەبەر لۆمەو توانج کابرای کافر کاتێ ئەوەی بیست خوریەی کەوتە دڵ و گوتی: جا چۆن ئەو خوایەی تۆ بەحەق نەناسم کە:

بەخاتری دوژمنانی راستی خۆی لەدۆستانی ناڕاستی خۆی تورەدەبێ؟!

# چاوەڕوان

نێو و نێوبانگی شێخی شبلی دەهەموو وڵاتدا دەنگی دابۆوە، کابرایەک مەتعەم واتە چێشتخانەو بەقەولی ئێرانێکان غەزاخۆری یەکی هەبوو و لێی ببوو بەئارەزو، ئای چەند خۆش دەبێ ئەگەر شێخی شبلی بێ و بەلانی کەمەوە رۆژێک یا تا قەژەمێک میوانم بێ.

سرت و خورت کەوتبوو نێو خەڵک و دەیانگوت: ئەو رۆژانە شێخ دێتە ئەو شارە هەر بۆیە زیاتر لە بەر دەرکی چێشتخانەکەی دادە نیشت بەڵکوو شێخ میوانی بێ وئەو بەرەکەتەی بەر لەهەمووکەس بە نسیب بێ.

رۆژێک دەقرچە قرچی نیوە ڕۆ دا پیاوێکی لەڕو لاوازی یەکجار زۆر برسی بەپەلە هاتەبەردمی وگوتی: زۆر برسیم ئەگەر تاقە نانێکم بدەیەی خێرێکی گەورەت دەگاتێ.

کابرا کە هۆشی لە دەوروبەری بوو کە نەکا شێخ بێت و ڕابیرێ و لەکیسی بچێ، بە تورەیی گوتی: خوا بتداتێ ئێمە نانمان نییە.

کابرای برسی گوتی: بەشی ئەوەندە هەرهەیە، لە برسان خۆم لە سەر پێ راناگرم، پێخۆرم ناوێ، بەتاقەنانێکی ویشکی ڕازیم.

**کابرا گوتی:** لاچۆ لە پێش چاوم ون بە، هەر پیرو سواڵکەرێک ئەگەر قەرار با نانێکم داباتێ ئێستا خاوەنی ئەودەم و دەزگا و دوکانە نەدە بووم، پرۆخوا ڕۆزیت لە جێیەکی دیکە بداتێ.

برسی ڕۆیشت ودورکەوتەوە،کابرایەک کە دەماوەی قسەکردنی ئەو دووانە دا چاوی لێیان بوو،کاتێ کابرای برسی دورکەوتەوە،هاتە پێش وگوتی حەیف نەتدایە وچاوە ڕوانییەکەت بە خۆرایی چوو.

خاوەنی چێشتخانە بە تورەیی گوتی: دەی جا زگت پێی دەسوتا بۆخۆت بتدابایە،کابرا گوتی: فەرق دەکا، من چاوە ڕوانی ئەو میوانە نەبووم، بەڵام وەک بزانم تۆ لە مێژە چاوەڕێی هاتنی شبلی، ئاخر بێخەبەر ئەو ڕوتە هەژارە شبلی بوو،کابرا تا ئەوەی بیست، دوکانی بەجێهێشت و بە غار بە دوایدا ڕۆیی،گەیشتەوە سەری و خۆی دە بەر

لاقی هاویشت و ملی نا لەگریان و داوای لێبوردنی لێکرد وگوتی: دەبێ میوانم بی.

**شبلی گوتی:** تا تەنیا بووم و نەتدە ناسیم بە تاقەنانێکی ویشکی ڕازی بووم، بە ڵام ئێستاکە ناسیوتم حازر نیم بێ فەقیر و هەژاری ئەو شارە هیچ پخۆم، بانگێشتنەکەت قبوڵ دەکەم بەڵام بەو مەرجەی دەسکورت و هەژاری نێو شار هەموویان دە و بانگێشتنەدا بن،کابرا گوتی: بە سەرچاوان.

ئەو شەوە سفرەیەکی وەهای ڕازاندەوە سەروبەری دیار نەبوو، تەنانەت بنیادە می تێریش لە دیتنی ئەو سفرە یە ئیشتیای خواردنی دەکراوە، دەوراندە ورفەقیرو ڕەش و ڕوتی شار لە سفرەکە هاڵابوون،هەراو زەنازە نایەک بووکەس گوێی لە قسەی کەس نە دەبوو، دەو  کاتە یدا ئەوەی لە پەنا شبلی دانیشتبوو، ڕوی دەشێخ کردوگوتی: زۆرم پێخۆشە لە نێو ئەوانەی دێرەدان ڕوخساری جهەننەمییەکم بە نیشان دەی.

شێخ دەستی بۆ خانە خوێ ڕاداشت وگوتی: ئەوە تا تێری چاولێکە، بە خاتری ناو و ناوبانگی خۆی وبۆ ئەوەی لە نێوخە ڵکدا خۆی ڕانێ و بڵی شبلی میوانم بووە، ئەم شەو بەلانی کەمەوە سەت دیناری زێری خەرج کردووە، بەڵام هەر ئەوکابرایە نیوەڕۆی  ڕابردوکەمنی نەدەناسی، حازر نەبوو دە ڕێی خوادا تاقەنانێکی ویشکیم بداتێ.

# سۆزی دەرون

نیوە شەوێک جوبرائیل گوێی لێبووکە خوای گەورە دەیفەرموو: (بەڵێ، بەڵێ، ئەی بەندەی من) و بەو چەشنە وڵامی هاوار و پاڕانەوەی یەکێ لە بەندەکانی خۆی دە داوە.

**جوبرائیل گوتی:** وادیارە یەکێ لەبەندە پاک وچاکەکانی خوایە کەبەلای بینایی چاوانەوە خۆشەویستە وخەریکی ڕاز و نیازە، خۆ لەوکاتە شدا بۆم نییە هیچ پرسیارێک بکەم، واباشە بڕۆم وبۆخۆم ئەو بەندە بەختەوەرەی ببینم و بیناسم و بگەڕێمەوە.

جوبرائیل هات و بەئاسمانەکاندا گەڕا،لەهیچ کوێ نیشانێکی لەو عابیدە شەوبێدارە وەگیر نەکەوت،کەگەڕاوە دیتی پاڕانەوەی ئەوبەندەیە هەروا بەردەوامە و سەرنجی بارەگای خواوەندی بۆلای خۆی ڕاکێشاوە.

**جوبرائیل گوتی:** خۆ ئاوا نابێ، من جوبرائیل بم و ئەو بەندە پاکەی خوا نەناسم، لە لایەکی دیکەوە من مەعمووری ڕاگە یاندنی پەیامم، دەی ئەوەهات وفەرمانم پێدرا تاکوو پەیامێکی بۆ ببەم، خۆ ناکرێ بەجێگاکەی نەزانم.

ئەو جار، دەچاوتروکانێکدا هاتە سەر زەوی، سەری کێشا ماڵی کابەو هەرکوێ مزگەوتێکی گەورەی پێ شک دە هات، ئینجا تەواوەتی کوێستان و پێدەشت و دورگەکان گەڕا،بەڵام لە هیچ کوێ سۆراغی خاوەنی ئەو دەنگەی وەگیر نەکەوت، ناچار گەڕاوە ولە جێی خۆی دانیشت وکڕنۆشی بۆ بارەگای بەرهەم هێنەری برد وگوتی: خوایە بۆخۆت شارەزای و دەزانی دەمەویست ئەو بەندە پاکەی کە دڵی بەلای تۆوە بوو ببینمەوە وبیناسم، بەڵام بەداخەوە هەرچی گەڕام نەمدیتەوە.

**خوافەرمووی:** باش وایە بیناسی،بڕۆ سەرێک لە بوتخانەکەی نزیک شاری ڕۆمێ بدە تا هەموو شتێ لەو بارە دا لە تۆ ئاشکرا بێ.

جوبرائیل بێ ڕاوەستان خۆی گەیاندە ئەو بوتخانەیە.

چاوی بە پیاوێک کەوت، لە بە ڕامبەر بوتێکدا چۆکی دادابوو هۆڕهۆڕ دەگریا و دەپاڕاوە، دیاربوو دڵشکاوو لێقەوماوو هەناسەساردە.

**جوبرائیل گەڕاوە وگوتی:** ئەی گەورەی بێ شەریک، غەیبی نازانم و لەکاری خواوەندی سەرە دەرناکەم، نهێنییەک هەیە، لە من ئاشکرا نییەو هیچی دەبارە دا نازانم.

مەگەر بە خەڵکمان نەگوتووەکە جگە لە خواهیچی دیکە مەپەرەستن ودەبەرامبەر هیچ کەس وهیچ شتێکدا لارەمل مەبن؟ مەگەر ئەو هەموو پێغە مبەرانە بەرگریان لە بوت پەرەستی نەکردووە؟ ئیدی دەوە ناگەم نازانم چۆناو چۆن ئەو بوت پەرەستە سەرنجی خواوەندی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە؟!

**خوا فەرمووی:** راست دەکەی، بەڕواڵەت وایە، ئەو بەندە یەکڕنۆشی بۆ بوت بردووە، بەڵام هەموو هۆش و بیری بەلای کەسێکەوە یەکە دەتوانێ دەفریای بێ، ئەو ئینسانەچاکە، پاکە، تەنیایە وپەیامی پێغەمبەرانی پێ ڕانەگەیشتووە، دەنا ئێستا بوتی نە دەپەرەست.

ئەگەردە وحاڵە دا ئێمە دەفریای نەیەین،کێ هەیە بە دادی ڕابگا و لە گێژاوی ئەو خەم و پەژارەیە رزگاری کات؟

**جوبرائیل گوتی:** کەس، خوایەگەورەیی هەرشیاوی تۆیە ودنیا تەنیا بە گەورەیی تۆوە پایەدارە و هەموو چاو لە دەستی تۆین وتۆ ئەی خوای گەورە یار و یاریدە دەری هەموانی.

# تاوانی شەیتان

کابرایەک بە داد وفیغان هاتە لای دانیالی پێغەمبەر وگوتی: چیم لێدەکەی قوربان؟ ئامان لە دەستی شەیتان.

**دانیال پرسی:** بۆ شەیتان چی لێکردوی؟

**پیاوەکەگوتی:** جا هیچ، لە لایەکەوە ئێوە ئەنبیا وئەولیا دەرسی دین و ئەخلاق و چاکەی بە ئێمە دەدەن، لە لایەکی دیکەوە شەیتان ناهێڵی کاری ئێمە راست بێ، ناهێڵی چاکەی بکەین وله خراپانمان نزیک دەکاتەوە.

**دانیال پرسی:** چۆن ناهێڵی؟ مەبەستت ئەوەیەکە لەشکرت دەکێشێتە سەرو دەگەڵت بەشەر دێ و ناچارت دەکا خراپەی بکەی؟

**پیاوەکەگوتی:** نا قوربان، وەک دەفەرمووی نا، بە ڵام دایم کەڵکەڵەو و بۆ خراپەکردن هانم دەدا، شەوو رۆژ خەریکەفریوم دەدا و دەسبەردارم نابێ.

**دانیال گوتی:** دەبێ ڕونتر بدوێی، تا بزانم شەیتان چت لێدەکا؟ ئایا وەختایەک نوێژێ دەکەی دێـی و قەنەقدیت دەدا وناهێڵی نوێژەکەت بکەی، یا وەختایەک دەتەوێ پووڵێک لە رێی خوادا بدەی یا ئەو قەرزانەی لە سەرتە بیاندەیەوە دێ جومگەت دەگرێ و ناهێڵی، یا وەختایەک دەتەوێ بەرەو شوێنێکی باش بچی، دەگاتە سەرت و پەتت دەکا و ڕاتدەکێشێتە قومارخانە، یا وەختایەک دەگەڵ خەڵک خەریکی وتووێژی، خۆی داوێتە نێو زارت و لەجیاتی تۆ قسەی سووک بەخەڵکی دەڵێ؟ یا وەختایەک دەگەڵ خەڵک خەریکی سەودا ومعامەلەی دێ لە باتی تۆ پوڵی زیادی لە خەڵک وەردەگرێ و دەگیرفانی تۆی دەنێ؟ بڵی بزانم ئایا ئەو کارانەت لە گەڵ دەکا؟

**پیاوەکەگوتی:** ئەوانە ناکا، بەڵام نازانم چۆنت تێ بگەیێنم، شەیتان دم دەهەموو کارەکانی من وەردە دا، هەتا دێم وشیار بمەوە، دەبینم لە مێژە فریوی داوم،بەڕاستی لە دەستانی جاڕز بووم و ئامادە نیم تاقەگوناە و تاوانێک وەعۆدەی خۆم بگرم.

**دانیال گوتی:** پێم سەیرە بەو ئەندازە لە دەست شەیتان جاڕز بووی! ئەی بۆ شەیتان ناتوانێ من فریودا؟! خۆ لە چاو من کلک و گوێت لێ نەڕواوە.

دەبینی منیش بنیادە مێکم وەک تۆ، تۆ غەدرێ دەکەی دە نا چۆن تاوانی خۆت دەخەیە ئەستۆی شەیتان؟

**کابرا گوتی:** نەخێر من بۆ خۆم زۆرم پێ خۆشە باش بم بەڵام ئەو لەکۆڵم نابێتەوە.

**دانیال گوتی:** زۆرم پێ سەیرە، جێی ژیان وگوزە رانت کوێیە؟

**کابرا گوتی:** هەر لەو نزیکانەم لەگەڕەکی خوارێ، بەسەری تۆ قوربان ئەو لەعنەتی یە هێندەی کاری خراپ پێکردووم لە لای خەڵکیش ئابڕو و حەیام نەماوە و وام لێهاتووە لەدەستانی دەربەدەری هەندەران بم.

**دانیال پرسی:** ناوت چی یە؟

**کابرا گوتی:** ناوم ((خلەی مچە پۆتێ))، لە خێڵی وەستا پیرەم تەنانەت شۆرە تیشم گۆڕیوە، بەڵام شەیتان دەست بەردارم نابێ.

**دانیال گوتی:** دەی دەی، کەوابێ خلەی مچە پوتی ئەتۆی؟!

کابرا بە سەرسورماوی پرسی: بۆ لە بارەی مندا شتێکت زانیوە؟

**دانیال گوتی:** هەتا دوێنێ نەمدە ناسی، بەڵام دوێنێ ئێوارێ شەیتان هاتە ئێرە و لە دەستی تو داد و فیغانی بوو.

**کابرا گوتی:** شەیتان؟ شەیتان شکایەتی لە من بوو؟ چی دەگوت؟

**دانیال گوتی:** شەیتان دەیگوت؛ خلەی مچە پوتی دەست بەردارم نابێ و لەکۆڵم نابێتەوە، زوڵمم لێدەکا، ئەوکات تکای لێکردم و لە بەرم پاڕاوە بەدواتدا بگەڕێم و بتبینمەوە وهێندێکت ئاموژگاری بکەم بە ڵکوو خێری قەبری بابت وازی لێ بێنی.

**کابرا گوتی:** جا ئاخر تۆ لێت نە پرسی من چیم لێکردووە، کە هێندەلێم داغدارە؟

**دانیال گوتی:** چۆن لێم نەپرسی؟! پرسیم لە وڵامم دا گوتی: ئاخر من شەیتانم و بە لەعنەت کراوم، رۆژی یەکەم کە بە لەعنەت کرام ئیجازەم لە خوا وەرگرت تا دە دنیادا بمێنمەوە و بۆ کارەکانم قەرار و مەدارێکم داناوە.

بریار وابوو هەرچی خراپەیە دە چنگی مندا بێ و هەرچی چاکەشە دەبەر دەستی خواناسان و چاکەکاران دا بێ، کە چی خلەی مچە پوتی

پێی دەکەوشی من ناوە و هەرچی خراپەیە لە چنگ منی دەرهێناوە و بۆخۆی دەیانکاو پاشان من وەبەر لە عنەت وجنێوان دەدا.

بۆ نموونە دەتوانێ نوێژبکا، نایکا، رۆژوی بگرێ نایانگرێ، دەتوانێ ئەوەی هەیەتی خەرجی چاکەو پیاوەتی بکا بەڵام نایکا، دەس پری وگوێ پری و کڵاو لە سەر خەڵک‌نان و خەیانەت بە دۆست، کاری منە و قومارخانەو چەقەخانە مزڵی منە کە چی داگیری کردوون و رێم ناداتەوە، دایم خەریکی بوختان و درۆ و دەلەسە و ڕاپۆرت و ماڵی خەڵک وێران‌کردنێیە، هەرچی رێیەلە منی پریوەتەوە، باسی کێهەکاری بکەم؟ ئەی دانیال وەختە لە داخانی وەزگ دەم دایم کڵاوم لە سەردەنێ وفێڵم لێدەکا، دەستی بە هەنگوینەوەی دەزاری نێم دەیگەزێ، هەرکانییەک ئاوی لێ بخواتەوە بەردی تێداوێ، دەرقەتی نایەم، وەختایەکیش ئەو کارانە دەکا و پەشیمان دەبێتەوە گورج کوری پوتەی دێتەزگ من و دەڵێ: لە عنەت لە شەیتان.

بۆخۆی سەودایە دەکاو دەستی خەڵک لە بن پیلیان را دەیرێ، تاوانەکەی دەخاتە ئەستۆی من، ئاخر دانیال تۆ لێی بپرسە بزانەکەنگێ من بەزۆری دەستیم گرتووە و بەرە و خراپە ڕامکێشاوە، یا پارووم کردووە وبە زۆری دەزاریم ڕۆکردووە و رۆژوم پێ شکاندووە، دانیال وام لێهاتووە لە داخانی وەزگ دەم، لێی بپرسە بزانە من چ ناحەقییەکم لێکردووە؟ وازم لێ ناهێنێ.

شەیتان ئەوانەی گوت و لەبەر من پاڕاوە بانگت کەم و ئامۆژگاریت کەم، نازانم تۆ چیت بەو بێچارەیە داوە؟ تۆکە خۆ دەکاری ئەو هەڵدە قوتێنی، دەبێ چاوە ڕوانی ئەوەش بکەی ئەویش قسەلەکاری تۆ بکاتەوە، تازە شەیتان، بەقسەی خۆت بۆ ئەنجامی هیچ کارێک زۆری لێ نەکردووی، تەنیا وە سوەسەی خستۆتە دڵت، دەباشە تۆ لەکنە خۆ بنیادەمی ودەبێ تێگەیشتنت بێ وجوابی نەدەیەوە وچاکی و پاکی بکەیە سەردێری کارەکانت، ئەوکات وەک منت لێدێ و شەیتان بە لە عنەتت ناکا.

بەو قسانە خلەی مچە پوتی ئارەقەی شەرمی لە ڕوو نیشت وگوتی: بە ڕاستی حەق بە تۆیە، هەرچی کردوومە بۆخۆم لە گەڵ خۆمم کردووە، تا ئێستا هەرچی کاری خۆم بوو وێلم کردبوو وە دوای

کاری شەیتان کەوتبووم، تازە ئەویش خۆ شێت نەبووە تاوانی من وەستۆی خۆی ناگرێ.

هەی لە عنەت لە شەیتان

# وردەواڵە

### دەرگای ڕەحمەت

یەکێک بەسۆز و کوڵەوەلەبەر قاپی خوا دەپاڕاوەو دەیگوت: ئەی خوای گەورە، تۆ گەورەیی خۆت دەرگایەکی رەحمەتم بۆ بکەوەو ناهومێدم مەکە. رابیعا گوێی لەو قسەیەبوو گوتی: بێخەبەر بۆ ئەو دەرگایەکەنگێ داخراوە؟

### ئاش

دەرۆژگاری کۆندا ئەگەر لەشوێنێک ئاوی لێ نەبایەتا ئاشی ئاوی لێ دامەزرێنن، بەرداشی سەرەوەیان لەئاژەڵێک جا وشتر با یا گوێدرێژ دەبەست ئەو ئاژەڵەبەدەوری خۆیدا دەسووڕاو بەو جورە ئاشی دەخستەگەڕ.

بەڵام بۆ ئەوەی دەو گەڕ و خولدانەدا سەری دەگێژەوەنەیە چاویان بە پەڕ ۆیەک دەبەست و ئێواران کەکاری ئاش کۆتایی پێدەهات پەڕۆکەیان لەچاوی دەکردەوە.

خاوەن دڵێک چاوی بەو دیمەنەکەوت، چۆ دەفکرەوەو دەستی خەمی دە ئەژنۆیان وەرێنا، هاورێیەک لەهۆی ئەو خەمەکوت و پرەی پرسی، خاوەن دڵ گوتی: وشتری بێچارەلە بەیانییەوە چاوەکانی بەستراون و دەگەڕ و خولدایە، وادەزانێ رێگایەکی دور و درێژی بریوە، بەڵام کاتی ئێوارە کەچاوی دەکەنەوە، دەبینێ هەروا لەجێی خۆیەتی و تەنیا شەکەتی ڕێیەی پێماوە.

کەوتمەبیری حاڵ و باڵی خۆم و ئینسانەکان، تا ئەو کاتەی زیندوین یەخسیری یاساکانی ژیانین و هەروا چاوبەستەو سەرگەردان بەدەوری خۆماندا دەخولێینەوە و زەمانێ لەو حاڵەرزگاریمان دێ، کەدەجەغزی ژیاندا نەماوین.

**چۆنی**

رۆژێک شێخی خەرقانی لە دنیا دارێکی پرسی: چۆنی؟

گوتی: جا چۆن بم؟ لە سەرسفرەی خوا دەخۆم و دەژێر فەرمانی شەیتان دام.

**پێویست بەڕەحمەت**

کابرایەکی ساماندار لە دوای نوێژ، سەری بۆ ئاسمان هەڵبڕیبوو دەیگوت: ئەی خوای گەورە پێویستیم بەڕەحمەتی تۆیە،کارم ڕاست بێنە چونکی هەر تۆ کارسازی کارانی.

قاڵبوویەکی ڕێگەی عیرفان گوێی لێبوو گوتی: بابەکەم ئەو قسانە چین دەیانکەی؟کۆشکێکت هەیە سەری لە کەشکە ڵانی فەلەک داوە، دارو دیواریت زێڕوەشان کردووە، غوڵام و قەرەواش دەستەو نەزەر ئامادەی خزمەتن، خۆ تۆ چیت تێدا نە هێشتۆتەوە وجێگایەکت بۆ ڕەحم پێکردنێ نەماوە، خۆ ئەگەر وەک من بەشت رۆژێ نانێک بایە، حەقت بوو ئەو قسانە بکەی ئێستاش کاکی خۆم تا ئەو کاتەی واز لە دنیاپەرەستی نەهێنی ئاسوودە نابی هەرکات توانیت وازت لەو شتانە هێناکە دڵت پێداون، دێیە ڕیزی پیاوچاکان و دوعاکانیشت دەگەنە جێی خۆیان.

**مەرگ بەڕوسوری**

وەختایەک لە مەبەستی حەللاج حاڵی نەبوون، مەحکومیان کرد بە لە داردان، هەرچەند هاواری کرد قسەی من حەقە،کەس نەیبیست، هەڵیان واسی و بە وەحشیانەترین شێوەکوشتیان، بڕیاریان دا بۆ لە ناو بردنی، پاشی هەڵاوەسین دەست و لاقی ببەڕێنن.

کاتێ فەرمان بەڕێوە چوو، هێندەی خوێن لە بەر ڕۆیی، ڕەنگی وەک کارە با زەرد هەڵگەڕا، دەو حاڵە دا یەکێک لێی پرسی: دوایین ئارەزووت چییە؟

حەللاج گوتی: ئەگەر زەحمەت نابێ بە دەستت لەو خوێنەی لە بەرم دە ڕوا بەسەر و ڕوم دا بێنە، با بە روسوری بمرم و ئەو پیاوکوژو ناحاڵیانە بە ڕوو زەردیم نەبینن و گومانی ئەوە نەکەن کە لە ترسی وان زەرد هەڵگەڕاوم.

### بەئەندازە

کابرایەک ئەوەندەی ئارەق خواردبۆوە خۆی پێ لەسەرلاق ڕانە دەگیرا و هەروا لاکەی سەری دەهات، ڕێبوارێکی ئاشنا توشی هات، بۆ ئەوەی دە وحاڵ و وەزعەدا نەیبینن و ئاپڕوی نەچێ، هەڵیگرتەوە و دەجە واڵێکی ناو هاویشتێ سەر پشتی وڵاغەکەی و بۆ لای ماڵێی بردەوە، دەرێگادا تووشی مەستێکی دیکە بوون کە ئەویش بە دەردی مەستەکەی دیکە دوچار بوو، مەستی نێو جەواڵ کە تەنیا سەری بەدەرەوە بوو هەرای لە مەستەکەی دەرێ کرد وگوتی: ئاهای کاکە، دوو پیاڵەت کە متر خواردباوە تا توانیبات وەک من شەق و پەق بەرێیە دا پڕۆی.

بەراستی خەڵکی زەمانەش زۆربەی بەو دەردەی دوچارن، چونکی بۆ خۆیان و عەیبەکانیان دەجەواڵ دان ئاگایان لێ نییەکە چەندە عەیبدارن وتەنیا عەیبی خەڵکیان لە بەر چاوە.

### منەت بار بە

بەعزە ڕووداوو بەسەرهاتێک هەیەکە ئینسان هەرچی دەکا بناغەی عیلمی وانی بۆ نادۆزێتەوە ولەوانەیە بۆ هەمیشەوەک معەممایەک بمێننەوە: رۆژێک شێخی خەرقانی ماندو وشەکەت و برسی گەیشتە نەیشابوور، چوو دەوێرانە یەکەوە و ماوەی حەوتەیەک بە برسێتی ڕابیوارد، ئاخری سەری هەڵێنا و پاڕاوە: ئاخر خوایەگیان، تاقە نانێکم دەیە خۆ لە خەزێنەت کەم نابێتەوە، لەوڵامدا دەنگێک هاتە بن گوێی: ئەی شێخ هیچ نانێک بێ ڕەنج پەیدا نابێ ئەگەر نانت دەوێ هەستە پرۆکارێک بکە، بەلانی کەمەوە پرۆ دەوری مەیدانی شارگەسک دە،کاتێ تەواو خاوێنت کردەوە زێڕێکی بەقەد نیوەی دەنکە جۆیەک دەبینێوە، هەڵیگرەوە بیدە بەنان و خۆتی پێ تێرکە.

**شێخ گوتی:** ئاخر ئەی خاوەنی دەنگ مەیدان ماڵین و خاوێنکردنەوە پێویستی بەگەسک ومەدونە هەیە، ئەوان لەکوێ پەیدا کەم؟

**دەنگەکەگوتێوە:** ئیدی ئەوەی بۆخۆت دەزانی.

شێخ ڕۆیشتە نێوشار،گەسک ومدونەیەکی بە ئەمانەت وەرگرت و ملی لە ماشتنی مەیدان نا،کاتێ تەواو بوو زێڕێکی بەقەد نیوەی دەنکە جۆیەک دیتەوە. لە خۆشیان پریدایە وبەپەلە خۆی گەیاندە نانەواخانە

ونانێکی پێکرى، بەڵام خۆشییەکەى هێندەى نەخایاند وەبیری هاتەوەکەگەسک ومەدونەکەى لە بیر چووە، دەپەژارەکەوت وگوتى: ئاخر خوایە ئەوەچ بەڵایەک بوو تووشى بووم؟ ئێستا منى ڕوت و نە دار بەکامە پوڵ ئەو گەسک ومەدونەیە بۆ خاوەنەکەى بکڕمەوە؟ لە خەجاڵە تیان خۆى دەوێرانەکە هاویشتەوە، بەڵام هەرکە پێى دەژورێ نا، دیتى گەسک و مەدونەکە دەپێش خۆیدا لەوێن.

لەدیتنى وان نەیزانى ناڕەحەت بێ یا کەیف ساز؟ سەرى هەڵێنا و گوتى: ئاخر ئەى خۆشەویست ئەوە چکارێک بوو لەگەڵمت کرد؟ خۆ نیوە عومر بووم؟

دەنگە ئاشناکە هاتەوەگوێى: نانت پەیدا کرد، پێمان حەیف بوو بێ پێخۆر بى، دیتنەوەى وانە بۆخۆى وەک پێخۆر وایە.

**ئەمەگناسی**

لە ڕۆژگارى کۆندا هەرحاکم و دەسەڵاتدارێک جگە لە غوڵامانى ئاسایى، غوڵامێکى تایبەتى هەبوو کە دەبەر دەستیدا هەڵدە سورا وکارەکانى تایبەتى پێ ئەنجام دە دا و نەیدە هێشت هەموو غوڵامەکانى دیکە لە سورو نهێنییەکانى نێو ماڵى ئاگادار بن، ئەو حاکمەى ئێمەش کە لە سەرى دە دوێین هەروەک هەموو حاکمەکانى دیکە، غوڵامێکى تایبە تى هەبوو،کە ئەوپەرى ڕێز و ئیحترامى حاکمى بە جێ دێنا و حاکمیش وەک کورو جگەرگۆشەى خۆى لێى دە ڕوانى و پەکى هیچ شتێکى نە دەخست و هەرچى ئارەزوى کردبا، بۆى بە جێ دێنا، بەکورتى هەر بە نێو غوڵام بوو دەنا هەموو کار و بارى ماڵ دە بەر دەستى ئەو غوڵامە دا بوو.

غوڵامیش بەو بەشەى خۆى ڕازى بوو و بەردە وام شوکرى خواى بەجێ دێنا و قەت هەستى بە ڕەنجى غوڵامێتى نە دەکرد و هەمیشە لاى وابوو ئەویش وەک خەڵکانى دەو روبەرى بنیادەمێکى سەربە خۆ وئازادە.

ڕۆژێک لە دەرەوەى شار دە باغێکى خۆش و دڵگردا خەریکى گەڕان بوون، حاکم سێوێکى بەدەستى خۆى پاکرد و فەرمووى غوڵامى کرد، غوڵام سێوەکەى لەت کرد و بە ئیشتیاوە ملى لە خواردنى نا، بەجورى

سەرلە قاندن وخواردنی غوڵام ڕا وا دیار بوو، تامی سێوەکە یەکجار خۆشەو قەتی سێوی وا بە تام نە خواردووە.

حاکم ئیشتیای چویە وگوتی: ئەگەر دەکرێ ئەو لە تەی نەت خواردووە بمدەوە، غوڵام بە ئیحترام لە تەکەی دایە،حاکم دەزاری نا، بەڵام هێشتا تەواو نەیجوتبوو لە بەر تفتی و تاڵیان فڕێی داوگوتی: ماڵت نەڕمێ ئەگەر دە تزانی هێندە تاڵە، بۆ وا بە ئیشتیاوە دەتخوارد؟

**غوڵام گوتی:** قوربان، ماوەی چە ند ساڵە شیرنیم لە دەستی تۆ خواردووە وەڵامی چاکەی تۆم پێ نەدراوەتەوە، چدەبێ؟ خۆلێم کەم نابێتەوە، با جارێکیش تاڵیت لە دەست وەرگرم و وەسەرە خۆمی نەهێنم.

حاکم لەو قسەیە زۆرکەیفساز بوو وئەوەندی دیکە پلەو پایەی ئەو غوڵامەی بە رز کردەوە.

## چاوپۆشی

کابرایەکی خراپی هەرزەکاری تاوانبار،کۆچی دوایی کرد و خزم و دراوسێ و ئاشنا بەڕێز و ئیحترامەوە نوێژیان لە سەرخوێند وکفن و دفنیان کرد و تەڵقینیان دادا و بە جێیان هێشت.

عابیدێک کە ئەوەی زانی هاواری لێ بڵیند بوو وملی نا لە هەرایە: پیاوی وا خراپ و خوانە ناس نەدەبوو لەگۆڕستانی گشتی بینێژن و پێویستی بەفاتیحا و ئەو بەرە و بەر نییە.

ئێستاکە مردووە ولەکۆڵ بووەتەوە وگڵتان وە سەر داوە، وا بزانن شتێکە مندار بووەتەوە، باسی مەکەن و لەبیر خۆتانی بەرنەوە.

ئەوشەوە عابید هەر جینگڵی دا وخەوی لێ نەکەوت،دەلای بەیانیدا خەو بەسەر چاوی کشا،کابرای بێ دین هاتە خەونی دە حاڵێکدا دە بەهەشتی خوا ولە خۆشترین جێگا بوو، عابید دەوخەونە دا بە سەر سورماوی پرسی: کورە خۆتۆ پیاوێکی زۆر خراپ بووی، چۆن بوو ئەو جێگا چاکەت وەگیر کەوت؟ کابرای مردوگوتی: هەرچی خراپەی کە کرد بووم هەمووم دەرحەق بەخۆم کردبوو و بەکەسم زەرەر نەگە یاندبوو،خوای گەورە لە بێ ڕەحمی تۆ دەریای رەحمەتی بزوت و چاوپۆشی لە تاوانەکانم کرد.

عابید هەرئەوکات لە خەو هەستا، هەلینگی داگۆرستان و بەسەری ڕووت و پێی پێخواس سەری تەسلیمی بۆ ئەوگۆڕە بەرداوە،گریا و پاڕاوە تا لێی ببورێ، پاش لالانەوەی زۆرگەڕاوە، دە حاڵێکدا مەرجی دا هەرگیز قسەیەکی وا نەکاکە تەنانەت دڵی دار و بەردیش لە خۆی بێشێنێ.

**بەچەند؟**

لاوێک تووشی پیرێک هات کە پشتی وەک کەوان داهاتبۆوە، لە ڕوی مەستی لاوەتی پرسی: ئەهۆی مامە پیرە، قیمەتی کەوانەی پشتت چەندە؟ بمدەیە و بایی ئەوم زێرلێ وەرگرە.

پیرەگوتی: مامەت دەسەرگەڕێ، ڕێچکەی ژیان ئەوکەوانەی بە خۆرایی پێ بەخشیوم، پەلەت نەبێ، زێرەکانت بۆ خۆت هەڵگرە، زۆری پێ ناچێ ژیان کەوانەیەکی بەو جورەش بە تۆدەبەخشی.

**چت دیت ؟**

ڕێبوارێک لە پیاوێکی پیری قەبرهەڵقەنی پرسی: دە ماوەی تەمەنتداکە خەریکی قەبرهەڵقەندن بووی چت دی؟

قەبرهەڵقەن گوتی: ماوەی حەفتا ساڵ کار و پیشەم هەڵقەندنی قەبر بوو و هەموو رۆژێ بە ئاشکرایی نێوانی مەرگ و ژیانم دەدی،کە چی نەفسی چڵێسم دە مێ نەمرد و بۆ جارێک دەفکری پاشە رۆژ نەکەوت.

**قەبری زاڵم**

ئێوارە یەکی ساردی زستان باڵوڵ بە درەنگ وەختەوە بۆلای گۆرستان دەچوو، کابرایەک تووشی بووگوتی: باڵوڵ درەنگ وەختە، سەرمایە بۆ کوێ دەچی؟

باڵوڵ گوتی: دەزانم سەرمایە، بۆیە دەچمەگۆرستان.

کابرا بە سەرسورماوی گوتی: ئاخر چۆن شتی وا دەبێ؟!

باڵوڵ گوتی: بۆ نابێ؟ مەگەر نەتزانیوە ئەمڕۆ زاڵمێک مردووە؟

کابرا گوتی: با

باڵوڵ گوتی: دەجا زۆر باشە دەچم خۆم لە بەرتینی ئاوری قەبری ئەوگەرم کە مەوە.

**باری منەت**

سوقراتی حەکیم بە پێیان ملی ڕێیەی گرتبووماندوو وشەکەت دەڕۆیشت، پیاوێکی دەستەنگ وهەژار تووشی بوو وسەرێکی لێ ڕاوەشاند وگوتی: ئاخر ئەی حەکیمی زانا، خۆ تۆ وەک من نی کەس نەتناسێ و بایخت بۆ دانە نێن، تۆ سوقڕاتی و هەزاران ئەمیر و حاکم و وەزیر دەئارەزوی دیداری تۆدان، بۆچی ناچی داوای ئەسپێکیان لێبکەی وخۆت لە پیادە ڕۆینێ ئاسوودەکەی؟

سوقڕات گوتی: قسەکەت جوانە، بەڵام توخوا لێم گەڕێ با لە شم باری پێم بێ، بەڵام ئەستۆم دە ژێر باری منەتی کە سدا نەبێ.

**تەختی بەتاڵ**

تەختی هارون بە تاڵ بوو، باڵوڵ وە ژورکەوت و بێ ئەوەی گوێ بداتە هیچ چوو لەسەر تەختەکە دانیشت.

مەعمووران گەیشتنە سەری، چت خواردووە؟ ترش وچەوەندەر، تا توانیان کوتایان، دە و کاتە دا هارون وە ژورکەوت و ڕوی دە باڵوڵ کرد وگوتی: چ باسە؟ باڵوڵ گوتی: هیچ باس نییە،فکر لە حاڵی تۆدەکەمەوە، من ماوەیەکی کورت لە سەر ئەو تەختە دانیشتم ئەوەندەیان تێ هەڵدام، تۆکە عومرێکە لە سەری دادە نیشی دەبێ دە رۆژی خۆیدا چەندەت تێ هەڵبدرێ؟

**ئاوەدانی**

ئیبراهیمی ئە دهەم بەرێیەکدا دەڕۆیی، سوارێک تووشی بوو ڕێی ئاوە دانی لێ پرسی، ئیبراهیم دەستی بۆگۆرستان ڕاداشت،کابرا تورە بوو قەمچی لێ هەڵسوراند و تێرو پری لێدا و بە جێی هێشت.

کەگەیشتە نزیک شار چاوی بەخەڵک کەوت، پۆل پۆل دەهاتنەدەر، سوار پرسی: چ باسە، وا بەتێکڕایی بۆکوێ دەچن؟

گوتیان: بیستوومانە ئیبراهیمی ئەدهەم لەو نزیکانەیە، دەچین بیگەینێ، چونکی دیتنی ئەو پیاوە مایەی بەرەکەتی هەردوو دنیایە.

سوار له نیشانەکانی ئیبراهیمی پرسی،کاتێ نیشانەکانی ئیبراهیمی ئەدهەمیان دایە، زانی کە چکارێکی ناڕەوای کردووە، بێ ڕاوەستان ڕکێفی لێدا وگەیشتەوە سەری و خۆی دە بەر لاقی هاویشت و وەک بارانی بەهار فرمێسکی باراند و داوای لێبوردنی کرد و بەگریان گوتی: ئەی زانای شارەزا، بۆچی وڵامی پرسیاری منت وا پێچەوانە داوە و تووشی ئەو هەڵە وکارە ناڕەوایەت کردم؟

ئیبراهیم گوتی: بە پێچەوانەم وڵام نە دایەوە، تۆ لە ئاوەدانیت پرسی، منیش لام وایە ڕۆژ بە ڕۆژ ژومارەی مردۆکان زیاتر دەبێ، هەرچەند ئاوەدانێکان ڕۆژ بەرۆژ ئاوە دانتر کەنەوە، ئاخری وێران دەبنەوە و دوایین ئاوەدانی گۆڕستانە.

خوویەک بیگری بەشیری حاتەمی تایی دەبەخشین وکەڕەم و پیاوە تیدا بێ وێنەبووە، بەچەشنێ تا ئێستاش باسی پیاوە تێکانی هەروا ماوە.

کاتێ کە حاتەم کۆچی دوایی کرد و براکەی خۆی بە خاوەنی شەشدانگی سەروەت و سامانی حاتەم دی،گوتی: من دەبێ زۆر لە حاتەم باشتر بم و لەو زیاتر خزمەتی هەژار و لێقە وماوان بکەم.

کاتێ دایکی ئەو قسەی بیست،گوتی: ڕۆڵەگیان، تۆ ناتوانی لەکاکت باشتر بی، پیاو نابێ تاریفی خۆی بکا، لە خوات بوێ بتوانی درێژە بەپێوانی ڕێگای ئەو بدەی، یا بەلانی کەمەوە دە ژێر سێبەری ناوی پیرۆزی ئەودا بژی.

گوتی دایەگیان، ئەوەچ قسەیەکە؟ بۆ من چیم لەکاکم کە مترە؟

**دایکی گوتی:** ئەوەی لە بارە یدا دە دوێم دەگەڕێتەوە زەمانی مناڵیتان ئەوکات کە حاتەم لە بەر مەمکان بوو، تا مناڵێکمان نەهێنابا ومەمکێکم دەزاری ئەو مناڵە غەریبەیە نە نابا ئەومەمکەی دیکەمی نە دەگرت و ئەو شیرەی کە رسقی دیاری کراوی خۆی بوو بە تەنیایی نەیدە خوارد، بەڵام تۆکاتێ لە بەر مەمکان بووی وەختایەک مەمکێکم دەزاری دەنای، دەستت توند لە سەر مەمکەکەی دیکەم دادە نا تا نەکا بخافڵێی و یەکێک بێ و شیری مەمکەکەی دیکەم بخوا.

بە ڕاستی ڕۆڵەگیان پێم خۆشە لەو باشتر بی، بەڵام ئەو خوو و خدە ڕەسەنە دەبێ لە سەرە تاڕادەگەڵ سروشتی ئینسان هەڵشێلدرابێ.

### تاریفی نەزان

پیاوێک ڕۆیشتە لای ئیفلاتون وگوتی: فڵان کەس هێندی ئەرز و ئاسمانان تاریفی دەکردی، ئیفلاتون لە بیستنی ئەو قسەیە زۆر ناڕەحەت بوو چەپۆکێکی بەسەری خۆیدا داوگوتی: دەبێ چ هەڵەیەکم کردبێ کە ئەو نەزانە تاریفی کردووم؟ تاریفی نەزانێک هەزاران جەزرەبە و بەدبەختی بە دوادایە.

تاریفی خاوەن دڵێکی تێگە یشتووم پێ لە تاریفی هەزاران کەسی دیکە باشترە.

### گەورەترین پیاوەتی

ئەبوسەعید لە حەمام بوو کابرای کیسەکێش بە دەورەیدا دەهات و دەیشوشت، پاشی ماوەیەک، هەرچی چڵک وچە پەری بە لەشی شێخەوە بوو، بە کیسە ڕایدا سەر باسکی شێخ تاوەکوو ببینێ وبزانێ کە چۆنی خاوێن کردووەتەوە، دەو حاڵەدا کابرای کیسەکێش لە شێخی پرسی: تۆ کە لە عیلمی خواناسیدا هەڵکەوتەی دەورانی، بڵی بزانم گەورەترین پیاوەتی چییە؟

شێخ چاوێکی لە چڵکی سەر باسکی کرد وسەری هەڵێنا وگوتی: گەورە ترین پیاوەتی ئەوەیە ئەگەر چڵک وچە پەرێکت بە لەشی یەکێکەوەدیت، یا ئاکاری ناحەزت لە کەسێک بەرچاو کەوت، بێ ئەوەی کابرا بزانێ ئەو چڵکەیا ئەو ئاکارەی خاوێن کەیەوە و بەچاویدا نەدەیەوە، کابرا لە بیستنی ئەو قسەیە زانی چکارێکی ناحەزی کردووە، ئارەقەی شەرمی لە ڕوو نیشت، ئەبوسەعید کەزانی کابرا تێگەیشتووە و بەخۆیدا شکاوەتەوە داوای لێبوردنی کرد،کە عەیبی ئەوی بە چاویدا داوە تەوە.

### جەردە

شێخی بەسرە، ڕۆیشتە خزمەت ڕابیعا وگوتی: ئەی هەڵکەوتەو تێگە یشتووی دەوران، قسەیەکم بۆ بکەکەس نەیبیستبێ و دەهیچ کتێباندا نەخوێندرابێتەوە.

**رابیعا گوتی:** ئەی شێخ وشارەزای زەمانە، هێندێکم ڕیس هەبوو بامدان و بردمنە بازاڕ و فرۆشتمن، پوڵەکەیانم وەرگرت دوو پوول بوون، دە

پێشدا بەدەستێک وەرم گرتن بەڵام لە پاشان جوێم کردنەوە وهەر یەکەیانم دە دەستێکم نا، لەوەی ترسام ئەگەر جووت بن لێم ببنە دز وجەردە و ئیمانم بە تاڵان بەرن.

### دەستی بەتاڵ

ئەسکەندەر پاش ئەوەی حەوت ئیقلیمی دنیایەی گرت، بەفری پیری لە سەر نیشت و خەزانی تەمەن بەرگی بەهاری لە لەشی داماڵی و وردە هەنگاوی بەرە وگۆڕ پێ هەڵێناوە و دەجێ و بانی مەرگ کەوت.

ئەمیران و دەست و پێوەندان و دەسەڵاتدارانی وڵاتی لە خۆی کۆکردەوە و ڕوی تێکردن و گوتی: ئەمیران، پاڵەوانان، سەرکردەکان، خۆشەویستان، لە مەودای ژیانم ڕەنجی زۆرم کێشا ومەودام بە داگیرکەران نەداو زۆر وڵاتم لە ژێر چەکمەی ملهورو زۆرداران هێنادەر و لە هەر وڵاتەی چەند شتی نایابم هێنا وخەزنەی خۆم لە گەنجەکانی دنیایە پڕکرد،

ئارەزویەک نەما پێی نەگەم وکارێک نەما ئەنجامی دەم، ئێستا پاش پێوانی ئەو رێگا دور ودرێژە تێگەیشتم و بەڕەنجی بێ پسانە وەم بەو پلەیەگەیشتم،دنیایەکی سەیرە، هەرچی تێی دەفکرم، هەرچی باسی دەکەن، هەمووی دەژێر دە سەڵاتی من دایە،کە چی ئەو هەموو دەسەڵاتە توانایی بەرگری لە و رۆژە دیار کراوەی نییە و پێشی پێ بەمەرگی من ناگیرێ، تکام ئەوەیە: کاتێ مردم، لە دەری شار چادرێک هەڵدەن دەتابوتێکم نێن دەستی راستەم بێننە دەر خزم و دۆستان وکەسان لە دەورم شین بگێرن رێ بدەن هەرکەس پێی خۆش بوو بێ و دەستی بە تاڵی من ببینێ با تێبگەن ئەسکەندەرێک کە دنیای گرت، ئەوە بە دەستی بەتاڵ ئەو هەموو گەنج و سامان و دەسەڵات و دەست و پێوەندانە بەجێ دێڵێ و هیچیان دەفریای نایەن، با تێفکرن و تێبگەن دنیایەک کە بەقا و وەفای بۆ ئەسکەندەر نەبوو، شیاوی دڵ پێ بەستن نییە و ئاخری ناچارین بە دەستی بە تاڵەوە بەجێی بێڵین.

### ولامی بەجێ

کابرایەکی دەوڵەمەند، نۆکەرێکی پاک و دیندار و قسە لە ڕوی هەبوو، رۆژانە بێ پشوودان کاری دەکرد و شەوانە ماوەیەکی زۆرخەریکی

شەونوێژ وعیبادەت دەبوو، کابرای دەوڵەمەند ڕۆژێک پێی گوت ئەگەر ئەوجار بۆ شەونوێژکە هەستای وەخەبەرم بێنە با منیش دەسنوێژ هەڵگرم و وێرای تۆ نوێژبکەم.

نۆکەرگوتی: بەڕێز، هەستاندنت خۆراییە، تۆ ئەگەر دەردە دار وئاشق بی بۆ خۆت دەکاتی خۆیدا هەڵدەستی.

تۆ بنیادەمێکی کەکارت کۆتایی نایە بەڵام دایم بێکاری، یەکێک دەبێ کارت بۆ بکا و یەکێکیش لە خەو هەڵتبستێنێ، قوڕ وە سەر بنیادەمانی وەک تۆ، کە لە بەهەشت وجەهەننەم جێتان نابێتەوە.

## پرسیار

دێوانەیەک لە پاشای پرسی: تۆ زێرت خۆشتر دەوێ یا گوناە وتاوان؟

**پاشا گوتی:** بێ شک کەسێ کەزێر بناسێ و ئاگای لەقەدر وقیمەتی بێ ئەوی خۆشتر دەوێ.

**دیوانەگوتی:** کەوا دەزانی ئەی پاشا گیان، کاتێ کە مردی بۆ زێرەکان بە جێ دێڵی و تاوانەکان دە گەڵ خۆت دەبەی؟

## بووتی سۆمەنات

کاتێ مەحمود لە شکری کێشا سەر هیندوستان و ڕێی دەسۆمە نات کەوت، بوتی گەورە کە ناوی ((لات)) بوو وەگیری کەوت ودەستی بە سەردا گرت. هیندۆکان کۆ بوونەوە وئامادە بوون بوتی لات وە رگرنەوە ودەبەرامبە ردا دە هێندەی زێر بدەنێ.

بەڵام مەحمود ئامادەی ئەو سەودایە نەبوو، بوتی گەورەی دەئاور هاویشت وکردی بە خەڵووز، یەکێ لە ئەمیران ڕەخنەی لێگرت وگوتی: دەبوایە ئەو زێرەت لە کیس خۆت نە دابا.

**مەحمود گوتی:** ڕاست دەکەی بەڵام لەوە ترسام رۆژی جەزا، بەوانە بڵێن بوت پەرەست و بە من بڵێن بوت فرۆش.

## دەگەڕێم

دڵ بریندارێک چاوی بە مەجنون کەوت دەنێو خۆڵ وخاکدا لە شتێک دەگەڕا

**پرسی:** لە چی دەگەڕێی؟

**گوتی:** لە لەیلا

**پرسی:** جا لە یلا و ئێرە؟!

**گوتی:** هەموو جێیەک دەگەڕێم، ئاخری لە جێیەک دەیبینمەوە.

**بۆ نەختێ پێخۆر**

پیاوێک بە هەڵکەوت بە بەردە رکی قوتابخانە یەکدا ڕابرد، ئەسقەزا دەم وکاتی نیوە ڕۆ بوو، قوتابێکان خەریکی خواردنی نەهار بوون، ئەو زەمانی منداڵان بۆ نەهار نەدەچوونە وەماڵ و هەرکام پرێسکە نان و پێخۆری خۆیان پێبوو و دوای نان خواردن دەرسی پاش نیوە ڕۆیان دەستی پێدەکردەوە.

دەنێو ئەو پۆلە منداڵە دا چاوی بە دوو مناڵ کەوت یەکیان نانی ویشکی پێ بوو زۆر بە نابە دڵی دەیجووت و بەزەحمەت قووتی دەدا، بەڵام ئەوەی دیکەیان جگە لە نان پێخۆرێکی خۆشی پێبوو لەمل لە قاندنەکەیرا دیار بوو کە خۆراکەکەی چەندە خۆش و بەتامە.

ئەو مناڵەی نانی ویشکی پێ بوو گوتی: ئەگەر لە و پێخۆرەی پێتە هێندێکم بدەیەی زۆر باش دەبێ.

ئەوی پێخۆری پێ بوو گوتی: دەتدەمێ، بەڵام بەو شەرتەی ببی بە سەگی من.

مناڵەکەی دیکە قبوڵی کرد ودەستی کرد بە وەڕین و وە دوای کەوت ئەویش تاو نا تاوێک نەختێک لە پێخۆرەکەی داویشتە بەر دمی.

نزیک بە نیو سەعات ئەو کایەیان کرد وکابرا لە دیتنی حاڵ و باڵی ئەو مناڵە زۆر ناڕەحەت بوو زگی پێی سووتا وگوتی: چاوەکەم بۆچی بەو نانە ویشکەی خۆت قەناعەتت نەکرد ولە پێناو ژەمە پێخۆرێکدا خۆت کردە سەگ؟ ئەگەر ئینسان بەوەی کە هەیە وهەیەتی ڕازی بێ هەمیشە سەربڵیند وخاوەن قورساغە، بەڵام ئەوەی تەماحکارە وبە بەشی خۆی ڕازی نابێ، ناچار دەبێ سەری بەرز و بڵیندی لە بە رامبەر زۆرکەس و ناکەسی لە سەگ کە متر بەر داتەوە.

ئەو داستانە دە قابوسنامەشدا هاتووە

**دۆعای رابیعا**

رابیعا له قاپی خوا ده پاڕاوه: ئەی خوای گەوره به لوتفی خۆت کاری دنیای دوژمنان راست بێنەو ڕێگەی دنیای دیکه بۆ دۆستانت هەموارکه، منیش له هەر دوولایان بێ بەش و بەزیکر و یادی خۆتم خەریک‌که، چونکی ئەگەر دەبیری یەکێک له دنیاکاندا بم له یادی تۆ خافڵ دەبم، دەئەی خوای گەوره یادی تۆ بۆ من بەسه، له یادی خۆتم بێ بەش مەکه.

**دزی بەشەڕەف**

نیوه شەوێک دوو دز چوونه ماڵێک وخەریکی دزی بوون، تاریکه شەوێکی به سام بوو، وەختی وا دز له هەمووکەس زیاتر دەترسێ، به ئەسپایی خەریکی کۆکردنەوەی خرت و پرتی نێو ماڵەکه بوون وچیوای نه مابوو تێلەکه وکۆڵی خۆیان پرکەن، بەڵام له ناکاو یەکیان گوتی: غارده با بڕۆین، دزی دووهەمی که وایزانی خاوەن ماڵ وەخەبەر هاتووه بێ ئەوەی بپرسێ بۆ؟ دەگەڵ هاوڕێکەی به غار لەو ماڵەکه چوونه دەر.

کاتێ گەیشتنه دەر وپشوویەکیان هاتەوه بەر، دزی دووهەم پرسی: چبوو؟ کەسێک چاوی پێمان کەوت یا خاوەن ماڵ وەخەبەر هات؟

**دزی یەکەم گوتی:** هیچیان، دەتاریکاییدا که دەستم لەشت ومەکی ئەو ماڵه بۆ دزین دەکوتا، دەستم وەتەبەکی نانەکەیان کەوت و بێ ئەوەی ئاگام له خۆم بێ پەنجه نانێکم دەزارم نا وبەو جوره نان و نمەکی ئەو ماڵەم کرد، ترسام، چونکی ئەگەر دزیم له و ماڵەکردبا خوا نەخواسته نمەک‌گیر ده بووم.

له جێیەکیت خوارد نانێکی خاڵی خەیانەت مەکه به سەرو ماڵی

**ددانی سپی**

حەزرەتی عیسا و هاوڕێ یانی بەرێیەکدا ڕاده بردن تووشی کەلاکی سەگێکی تۆپیو هاتن.

حەزرەت ماوه یەک ڕاوەستا وپاشان ڕوی دەهاوڕێیانی کرد وگوتی: ئێوه له بارەی ئەو کەلاکەدا چ بیر دەکەنەوه؟

هاوڕێیان لێکتریان ڕوانی و نەیانده زانی مەبەستی عیسا لەو پرسیاره چی یه؟

**یەکیان گوتی:** لاشەی سەگێکی تۆپیوه.

**یەکێ گوتی:** با زوو بڕۆین، بۆگەنیوەکەی قڕی کردین.

**یەکیان گوتی:** رووالَە تێکی دزێو و ناشیرینی هەیە

**یەکیان گوتی:** شتێکی گڵاوە

**یەکێ گوتی:** وەختایەکی زیندوو بوو گڵاو بوو، ئێستا هەر باسی ناکرێ

**ئەوی دی گوتی:** چاچاو زاری چۆن داپچڕیوە؟ دەڵێی لە سەگە یانیگرەکانە بەتۆپیویش هەر دەڵێی دەیەوێ قەپاڵ لەشتێک بگرێ.

**عیسافەرموی:** ئەوانەی گوتتان هەمووی ڕاستن، بەڵام گیانلە بەرێکی بەوەفا و بە ئەمەگ بووە، پاسەوانێکی باش بووە، دۆست و دوژمنی لێک کردۆتەوە، بڕوانن ددانەکانی چەندە سپی و جوانن، باش نییە ئێمە تەنیا خراپەکانمان لە بەر چاو بێ، واباشە چاکەکانیش ببینین.

**ویستی دێوانە**

پادشا و دەسەڵاتداری وڵاتێک دەگەشت وگەڕانێکدا تووشی دێوانەیەک بوو، قسەو ئاکار و ڕەفتاری دێوانەکاری تێکرد وگوتی: ئەی دێوانە، من پاتشا و دەسەڵاتداری ئەو وڵاتەو خاوەنی تەخت و بەختم و هەموو کارێکم لە دەست دێ، داوایەکەم لێ بکە تا دەستور بدەم بۆتی فەراهەم کەن.

دێوانەکە دیتی پاشا گرنەی لێ گرتووە ودەست بەرداری نابێ،گوتی: قوربان، مێشان لە کۆڵم نابنەوە، دەچمە هەر لایەک، وە دوام دەکەون و ئازارم دە دەن، هەر دەڵێی تەنیا من دەو شارەدام،کاریان بە خەڵک نییە و لە شکریان کێشاوەتە سەر من فەرمان بدە با لە کۆڵم بنەوە.

پاشا بە سەر سوڕماوی گوتی: دێوانە، ئەوە چ خواستێکە؟ خۆ مێش دەژێر فەرمانی ئێمە دا نین!

دێوانە سەرێکی ڕاوە شاند وگوتی: جا ئەگەر تەنانەت مێش دەژێر فەرمانت دا نین ئەی پۆز و ئیفادەی چی لێدە دەی؟ و من داوای چیت لێ بکەم؟

دە ڕۆژگاری کۆندا، بنەماڵەیەکی دەسکورت کوڕێکیان بوو بەنێوی ڕامان، بزۆز و زیرەک وبەهۆش و تێگەیشتوو، بەردەوام هەوڵی ئەوەی دەدا بەڵکوو شتێکی تازە ونوێ فێر بێ و ڕاددەی زانستی خۆی بەرێتە سەر.

ڕامان هەرلە چکۆڵەیی ڕا وابوو، هێندەی پرسیار لە دایک و بابی دەکرد و ئەوەندەی لە قسان دەکۆڵێوە، تەواو جاڕزی دەکردن، زۆر جار دایک و بابی توانایی وڵامدانەوەیان نەبوو دەبەرامبەر ئەو پرسیارە یدا کە لێیان دەکرا تەواو دادەمان، ئەگەر بە جوابی دڵخوازی خۆی نەگەیشتبا دەڕۆیشتە لای خزم و دراوسێکان و لە وانیشی دەپرسێوە.

باوکی زۆر جار دەیگوت: نازانم سەرەنجامی ئەو منالەم چی لێدێتەوە؟ ئەوە منالانی هاوتەمەنی ئەو، لە کۆلان خەریکی تۆپێن وگالتەو ڕابواردنی خۆیانن، کە چی ڕامانی من خەریکی شتانێکەکە دەگەڵ تەمەنی یەک ناگرنەوە.

بە چکۆلە پیش ئەوکاتەی کە هێشتا نەچوبوقوتابخانە، پێی خۆش بوو،ئەسباب وشت و مەکی ماڵێ لێک هەڵوەشێنێ تا بزانێ چیان دەنێودایە؟ بەتایبەت هێندێکی ئەسبابی کایەی خۆی هەبوو، رۆژانە سێ چوار جار لە باڵێکی دەردێنان و وەسەرێکی دەخستنەوە، جاری وابوو بەدار و پەڕۆوشتە زیادێکانی نێو ماڵ، شتی وای ساز دەکرد،کە هەر خۆش بوو بێیە تەماشایان.

هێندە وە دوای دایکی کەوتبوو و لەکارانی کۆڵیبۆوە، ببوو بەکابانێکی تەواو و بۆ شێولێنان و ئەو بەرەو بەر، لە دایکی نەدەماوە.

وەختایەک پور و خاڵ و مام و خزمەکان دەهاتنە ماڵیان، لەوەی کە دەیانزانی ڕامان خۆ دەکاری گەوران هەڵدە قوتێنێ سەریان داویشتە سەری و دەپرسیارانیان دەگرت: دەی ڕامان گیان بڵی بزانم گەنم چۆن

شین دەبێ؟ پەڵەی ڕەنگی هەنار لە سەر پارچەو لیباس چۆن پادەکرێتەوە؟ چەسپی نیشاستە چۆن ساز دەبێ؟

ڕامان زۆر بەئیشتیاوە وڵامی پرسیارەکانی دەداوە و وایدەزانی بە ڕاستی نایزانن و دەیانەوێ لێی فێر بن، لە سەر چۆکان دادە نیشت و دەخۆی دەنووسا و هەوڵی خۆی دەدا، تا بە باشترین شێوە حاڵیان کا.

رۆژێک پوری لێی پرسی: ئەرێ ڕامان گیان، بۆچی وەک مناڵانی دیکە حەز بەکایەکردن ناکەی؟

ڕامان گوتی: هەموو کایەکان لە ومناڵانە باشتر دەزانم، تەنانەت هەرکات دەکایەکردن دا هەڵەیەکیان بێ، دێن لە من دەپرسن و منیش هەڵەکەیان بۆ ڕاست دەکەمەوە، قەت حەز لەکایەی نێو کۆڵان ناکەم،کایەی نێو ماڵێم زۆر پێ خۆشترە، ئەوانەی کە دەماڵیشدا فێریان دەبم بۆ خۆیان کایەن، ئینسان دڵی بە هەرچی خۆش بێ ئەو شتە دەتوانێ جێی کایەی بۆ بگرێتەوە، بۆ نموونە دوێنێ، بابم دەیەویست خشتەکان لە حەوش ڕا بەرێتە سەربان ودیواری هەورە بانەکە چاکاتەوە، هەلینگم دا و یارمەتیم دا،یەک یەک و دوو دوو خشتەکانم دەگەڵ وەسەربان خست و دیوارەکەم دە گەڵ دانا،کاتێ شەو داهات منالەکان ماندو وشەکەت، بێ ئەوەی شتێکیان بەشتێک کردبێ چوونەوە ماڵی خۆیان، بەڵام من و بابم دیوارێکمان دانابوو، سەرە ڕای ئەوانە، جیرانەکان سێ چوار جار دەنگیان دان کە چی کەس قسەی بە من نەگوت، لە هەمووی خۆشتر، ئێوارێ بابم دەستی بە سەرم دا هێنا وگوتی: ئافەرین بۆکوری خۆم، لە کوری هەمووکەس باشتری.

پوری گوتی: بابت راستی گوتووە ڕامانی ئێمە لە منالی هەمووکەس چاترە.

ڕامان هەتەڵۆکە ومەتەڵۆکە وپرسیاری هۆشی زۆر پێ خۆش بوو،کاتێ لە ماڵ لە یەکتریان دادێنا، بە وریایی گوێی هەڵدە خست تا فێریان بێ و سەر لەنوێ لە کەسانی دیکەی دابێنێتەوە.

لەتەمەنی شەش ساڵی بابی فێری خوێندن ونوسینی کرد، هێشتا ئەلف و بێی بە باشی نەناسیبوون دەیەویست تەواوی کتێبەکان بخوێنێتەوە،کتێبەکانی باوکی دێناگۆرێ، لێکی دەکردنەوە، پێیان دادە هات، بەڵام لە هەرلاپەڕە یەک ئەو پەڕی دە ووشەی بۆ دەبیندراوەکە لە ماناکەیان حالی دەبوو، لە هێندێک لە کتێبەکانیش کە بە زمانی بێگانە

نوسرابوون هەر هیچ تێ نە دەگەیی وسەرلە نوێ بۆ حاڵی بوون لە وان یەخەی باوکی دەگرتەوە، ئەرێ بابە ئەو کتێبە بۆلە خۆرا ڕەش کراوەتەوە؟ بۆچی ناخوێندرێتەوە؟

باوکی دەیگوت: رۆڵە گیان، زمانی ئێمە هیندییە، ئەلف و بێ یەکەشی ئەوانەن کە دەیانناسی، بەڵام دنیاگەورە و بەرینە و زۆرگەل و نەتەوەی تێدایە و هەرکام زمانی تایبەت بە خۆیان هەیە،کە دەگەڵ زمانی ئێمە جیاوازن،کوردی هەیە، فارسی هەیە، عەڕەبی، تورکی، چینی و یۆنانی و سەدان زمانی دیکە، هێندێک لە و زمانانە وەختایەک دەیاننوسن، ئەلف و بێیان هەر ئەو ئەلف و بێ یەی خۆمانن بە ڵام دەماناکەیان ناگەین.

ئەگەر بمانەوێ لێیان حاڵی بین دەبێ هەوڵی ئەوە بدەین زمانەکەیان فێر بین، هەروە کوو ئەوان بۆ تێگەیشتن لە ئێمە دەبێ زمانەکەمان فێر بن، بۆ نموونە: ئێمە بە هۆوەی دە و جامە دایە دەڵێین (پانی)، کوردەکان پێی دەڵێن (ئاو)، عەڕەبەکان پێی دەڵێن (ماء)، تورکەکان بە(سو) دەیناسن، جا ئەوەیە ئەگەر زمانەکانیان بزانین لە کتێبەکانیشیان حاڵی دەبین.

رامان گوتی: تێگەیشتم، بەڵام هۆوکتێبەگەورەکە پڕە لە خەت وخاڵی ورد ورد ئەوە چ جۆرەکتێبێکە؟

باوکی گوتی: ئەوکتێبە بە زمانێک نوسراوە کە ئەلف و بێ یەکە ی لە گەڵ ئەلف و بێی زمانی ئێمە جیاوازە، ئەوەی دەیانبینی ئەلف و بێی ئەو زمانن، خەت و خاڵ نین.

رامان دەقسەکانی بابی گەیشتبوو، بەڵام دەسبەردار نەبوو، دیسان دە یپرسی: دەی بابە نەدەکرا دە دنیا دا هەموو بە زمانێکیان قسەکردبا تاوە کوو هەموو لێک حاڵی بووبان و بە هاسانی توانیبایان کتێبەکان بخۆیننەوە؟

بابی دەیگوت: رۆڵە، ناوچەکانی سەر دنیا لە باری ئاو و هەوا، گوزەران، داب و نەریت، ئایین و زۆر شتی دیکە لێک جیاوازن،کە سانێک کە لە قەراغ دەریا دەژین زۆر شتی دەبارەی کەشتی و دەریا و بەلەم و لۆتکە و لەنگەرگا و... دەزانن، ئەوکەسانەی لە کوێستان دەژین زۆر شتی دە بارەی کوێستاندا دەزانن، زمان کەرەستە و وەسیلەیەکەکە پەیوەندی بەشوێنی ژیانی ئینسانەکانەوە هەیە و لەو رێیەوە

پێداویستێکانی خۆیانی پێ جێ بەجێ دەکەن، بۆ نموونە کەسێک کە دە دێدا دەژی وسەروکاری دەگەڵ کشت و کاڵ وئاژەڵدارییە زۆر شت وزۆر قسەی دە بارەی ئەو کارەیدا کە دەیکا دەزانێ دەحاڵێکدا لەوانەیەکەسانێک دەشاردا ژیان ببەنەسەرکە تەنانەت فەرقی مەر وبزن نەزانن، خەڵکی دێش هەروا، زۆر شت دەشاردا هەیە کە خەڵکی دێ چونکی سەرو کاریان دەگەڵی نییە تەنانەت دە ماناکەشی ناگەن، تازە باسی ئێمە لە سەر شارو دێ نییە، باسی ئێمە لە سەر دنیایەکی زۆر گەورەیەکەشتی زۆر جورا وجۆری تێدایە راستە ئەگەر خەڵکانی جیهان هەموو بەیەک زمان قسەیان کردبا زۆرباش دەبوو لەوانە بوو زۆر شەڕو شۆڕدە ودنیاداکۆتایی پێهاتباو باشتر لە هەست وئیحساسی یەکتر حاڵی بووبان مافی ئینسانی یەکتریان پێ شێل نەکردبا، بەڵام چ بمانەوێ و نەمانەوێ ئەو خەڵکانە بەشێوە نووسینی جوراوجورەوە هەن و ڕۆژ بە ڕۆژیش زیاتر خزمەت بە فەرهەنگەکەیان دەکەن و باشتر دەمێنن وکەس ناتوانێ حاشا لە هەبوونیان بکا، دوایەکەگەورە بووی ئەگەر بتەوێ دەتوانی چەند زمان لەو زمانانەفێر بی، بەڵام جارێ ئەوکتێبانە بۆ ئێستای تۆ زوویە، ئەگەر حەز لەکتێب خوێندنەوە دەکەی،کتێبەکانی تایبەتی تەمەنی خۆت، کە بۆم جیا کردوویەوە بیانخوێنەوە، بەڵام ئەوەت لە بیر بێ، دروستەکە خەڵکانی جیهان زمان و فەرهەنگیان لێک جیاوازە، بەڵام ناوی ئینسانیان لە سەرە، مادام کە ئینسان بن و ئینسانانە بیر بکەنەوە، پێویستە لە جیاتی شەڕ وشۆڕ زمانی یەکتر فێر بن و ڕێز و حورمەت بۆ فەرهەنگ و ئیحساسی یەکتر دانێن وحاشا لە هەبوونی یەکتر نەکەن.

باوکی ڕامان، هێندێکی کتێبی چکۆڵەی مناڵانە بۆ جیاکردبۆوە کە زۆربەیان حەکایەت و ڕووداووبەسەرهات بوون، تا بیانخوێنێتەوە ولە پاشان ئەوەی دە مێشکیدا دەما، بۆ باوکی بگێڕێتەوە.

زۆربەی ئەو کتێبانە دەسنووس و وێنەی جوان جوانیان تێدا کێشرابۆوە، ڕامان زوو زوو دەیخوێندنەوە وداوای کتێبی تازەی لە باوکی دەکردەوە وبە خوێندنەوەی هەر کتێبێک کۆڵێک پرسیاری تازەی دەهاتە دەمێشکێوە:بابە ئیفلاتوون کێ بوو؟ ئاگردان بەچی دەڵێن؟ شاروێران لە کوێیە؟

دێره دا نوسراوه ئینسان وپەری دەژێر فەرمانی حەزرەتی سولەیماندا بوون، مەبەست لە پەری چییە؟ ئەوانە وسەدان پرسیاری دیکە، تاوەکوو ڕۆژێک ڕامان حەکایەتی پەریانی وەگیرکەوت، خوێندێوه وپێی لە هەموو کتێبەکان سەیرتر بوو.

کچی شای پەریان وەک بەرق وبا دەچاوتروکانێکدا لە ڕۆژهەڵات ڕا دەڕۆیشتە رۆژاوا وبە ئەرز وئاسماندا دەگەڕا و دەقەسرێک دا دە ژیا و لە بەر چاوی نەیار و نامەحرەم ونونادیار بوو وهەرکەس دەگەڵی ئاشنا بووبا، چڵە موویەکی دە دایە، هەرکات تووشی گرفتێک بووبا، ئەو چڵە موویەی هەڵدەپروزاند،کچی شای پەریان دەسبەجێ لەوێ حازر دەبوو وهەرچی ئارەزوی ئاشناکەی با پێکی دێنا و لە وقسانە.

ڕامان، وەختایەک ئەو کتێبەی خوێندەوە، دیتی بەڕاستی قسەی سەیر سەیر دە و دنیایە دا هەیە،کە وایە لەکوێیە ئەوکچەی شای پەریان و ئەو ژیانەخۆش و شیرنەکە هەموو کەس ئارەزوی دەکەن؟ لێی بوو بە ئاوات و بڕیاریداهەرچۆنی بێ دەبێ دەگەڵ کچی شای پەریان ئاشنا بێ.

شەو لە بابی پرسی: ئەرێ بابە حەکایەتی شای پەریان راستە؟

**بابی گوتی:** ڕۆڵە ئەوانەحەکایەتن، دە حەکایەتانیشدا هێندێک جێ ڕاست و زۆر جێ بەرهەمی خەیاڵی بنیادەمن.

**ڕامان پرسی:** تۆ سەردەستە وسەرۆکی پەریان دەناسی؟

**بابی گوتی:** نا، من نایناسم، ئەوان خۆیان بە هەمووکەس نیشان نادەن، دیتنی وان کارێکی زەحمەتە.

**ڕامان پرسی:** ئەی ئەوانەی کە دەیانبینن چدەکەن و چۆناو چۆن دەگە ڵیان ئاشنا دەبن؟

**باوکی گوتی:** دەڵێن ئەوکەسانە چلەی دەکێشن، خۆیان ڕەنج دە دەن، لە خۆشی دنیا و خواردنی گۆشت چاوپۆشی دەکەن، ڕوحیان پاک دەکەنەوە وپلە و پایەی زانست و عیلمیان دەبە نە سەر، بە و جورە پەردەی ئەو نهێنییە لەبەر چاویان لادە چێ، ڕێی ئەو ئاشنا بوونە سورڕێکە کە لە هەمووکەس ئاشکرا نییە.

**ڕامان گوتی:** یانی ئەگەر تۆبا من، بمانەوێ پەریان ببینین، ناتوانین؟

**باوکی گوتی:** نا، رۆڵەگیان، ئەوەکاری هەموو کەس نییە، لە وڵاتی ئێمە دا تەنیا یەکێک دە گەڵیان سەروکاری هەیە، ئەوەش قسەی

خەڵکە، دەنا، ئەو تەنیا خۆی بە فەیلەسووف وحەکیم و ئەستێرە ناس دەزانێ، بەڵام لەوکارانەیرا کە دەیانکا، خەڵک لایان وایەبێ ونەبێ دەگەڵ پەریان ئاشنایە،گوتم دە وکارە یدا سوررێک هەیە، ئەوی دە وسوررەش بگا، ئیدی دە بارەیدا قسان ناکاوئم، توند زاری خۆی دەبەستێ.

**ڕامان گوتی:** بەڵام هەرچۆنێک بێ من دەمەوێ تێبگەم و دەگەڵ پەریان ئاشنابم، دەبێ پێم بڵێی ئەویەک نەفەرە کێیە و لە کوێیە؟

بابی دیتی وردە وردە توشی سەردەبێ، ناچار گوتی: رۆڵەگیان، دەزانی چییە؟ ئەوانە، ئەو قسانە، پاکی درۆن، دێو درۆیە، پەری درۆیە، دام و دەزگای پەریان، ئەوانە هەموویان بەرهەمی فکر وخەیاڵی ئینسانێکی بێکار بوون کە لە بەر بێکاریان لە ماڵی خۆی دانیشتووە وئەو جورە کتێبانەی نوسیوە تا مناڵان بیخۆیننەوە ولەوان ڕا فێری خوێندنەوەی شتی باشتر بن، ئەو قسانەپرو پووچن، تازە ئیدی ئیزنت پێ نادەم ئەو جورە کتێبانە بخوێنێوە وفکری خۆتیان پێوە ئاڵۆزکەی.

دەبێ لە مەو بە دوا کتێبی عیلمی بخوێنێوە وفێرەکار وپیشە بی ودە داهاتوودا هونەرێکت بێ،رۆڵە گیان، ئەوانەی دە وکتێبانە دان پاکی درۆن، درۆ، جا وەرە توخواکەی چۆن پێوە بووم؟

ڕامان زۆر تێکچوو ودە دڵی خۆیدا گوتی: درۆ نین، ئەگەر شتێک نەبێ دە کتێباندا ناینووسن، بابم بە بەرژەوەندەی نازانێ ونایەوێ رێنوێنیم بکا، بەڵام من بە هەرفێڵێک بێ دەبێ دەونهێنییە بگەم و بزانم چباسە.

لەوکاتی ڕا ڕامان دەفکری ئەوە دا بوو کەسێک بدۆزێتەوە کە لە و مەسەلەی حاڵی کا، ئەوندە بەوفکروخەیاڵانەوە نوستبوو هەرکە چاوی لە سەرێک دانا با خەونی بە پەریانەوە دەدی وپێی وابوو دە ئاسماندا خەریکی هەڵفڕینە.

تا دە هات وشیار بێتەوە ولە بارەیاندا پرسیارێک بکا،لە خەو ڕادە چەنی و هەودای خەون وخەیاڵی دەپسا.

ڕامان بە پیتۆڵی و وریایی وڵامی زۆر پرسیاری دە داوە، هەرچی نەیزانیبا لێر و لە وێ، لەم ولە و دە بپرسی، بەڵام ئێستا بۆ ئەو مەبەستە، بۆ ناسین و زانینی چۆنیەتی ژیانی پەریان،کەس نەبوو وڵامێکی باشی بداتەوە، باوکی کە هەر ئامادە نەبوو دەو بارەیە دا بدوێت، لە قسەکانی دایکیشی ڕا بۆی دەرکەوتبووکە هیچ دەبارەیاندا

نازانێ، پوریشی دەیگوت: تەنیا پیاوچاکان دەوبارەیە دا دەزانن بەڵام قەت بەلای کەسەوە نایدرکێنن.

کەوابێ پیاوچاکان و زانایان دەتوانن وڵامی من بدەنەوە، بەڵام بە داخەوە ئەوان ئامادە نین کەس لە و نهێنییە ئاگادارکەن، دەبێ بەفێڵێک لە بن زمانیان دە رکێشم، بەڵام ئاشنا بوون دەگەڵ چاکان و زانایان کارێکی هێندە هاسان نییە.

ڕامان بیری کردەوە، واباشە جارێ بەردێکی لە سەر ئەو پرسیارە دانێم و بێدەنگەی لێ بکەم، بەڵام لێرو لەوێ چاو بگێرم وگوێ هەڵخەم بە ڵکوو چاکان و زانایان بناسم و بە شێوەیەک خۆمیان دەگەڵ ئاشنا کەم.

ڕامان بۆ ئەوەی مەسەلەکەکۆن بێ دەوبارەیە دا لای کەس قسەی نەکردەوە، رۆژێک کتێبێکی دیکەی دەبارەی پەریاندا وەگیرکەوت، دایەوە بەبابی وگوتی: ها، بابە، حەز بەو جورە کتێبانە ناکەم، دەمەوێ شتێک بخوێنمەوە بەکاری ژیانم بێ.

بابی ئەو قسەی ڕامانی زۆر پێخۆش بوو، لە مەودوا هەموو رۆژێ کتێبی بابەت و جورا وجوری بۆ ڕامان دێناوە، ڕامان دەیخوێندنەوە ولە بارەی مەبەستی نێوکتێبەکان دە گەڵ بابی دەکەوتەوتووویژ، وردە وردە لە زۆر شتی وەک جوغرافیا و مێژوو و زمانەکانی یۆنانی وسانسکریت سەرراست بوو، بەڵام هەروا دەفکردا بوو بە ڵکوو بە جورێ لە ڕێگەی ئاشنایی دەگەڵ پەریان شارەزا بێ، دە وماوەیە دا هیچ کات ئەو دوو وشەی چاکان و زانایان لە مێشکی نەچوونە دەر.

رۆژێک کە هەلی بۆ هەڵکەوت لە باوکی پرسی: ئەرێ بابە دەو رۆژگارەدا کە ئێمە تێیدا دەژین،کێ لە هەموو کەس زاناترە؟

**باوکی گوتی:** رۆڵە گیان زانایانی دنیا زۆرن، من هەموویان ناناسم، بەڵام وەک دەڵێن لە وڵاتی خۆماندا، ماهان لە هەمووکەس پتر دەزانێ، چونکی دەگەڵ هەموو عیلمەکان ئاشنایە.

**ڕامان گوتی:** ئێستا کە ماهان لە هەمووکەس زاناترە، بڵێی لە هەموویانیش پیاو چاکتر نە بێ؟

**باوکی گوتی:** نازانم، لەوانەیە باشتریش بێ.

**ڕامان گوتی:** لەوانەی بۆچییە؟ بە دڵنیایی کەسێ کە، شتی زۆر بزانێ چاکە و خراپەکان دەناسێ و بە هەڵە ناچێ و هەر چاک دەبێ، بابی گوتی: نەخێر، رۆڵە گیان، زانین وکردەوە لێک جیاوازن.

بۆ نموونە وایدانێ تۆ نەجاڕی وکەس وەک تۆ نازانێ دەرک و پەنجەران سازکا، بەڵام بە هەڵکەوت دەرک و پەنجەرەی خراپیش سازدەکەی و هەرزانتریان دە فرۆشی.

**ڕامان گوتی:** ڕاست دەکەی جاری وایە ئینسان هەموو زانستی خۆی دەشتێکدا دەکار ناکا.

**بابی گوتی:** کە وابێ، دێرەدا تۆ زانای، بەڵام پیاوچاک نی، زانست عیلمە، بەڵام چاک بوون پەیوەندی بەئیمان و ئەخلاقەوە هەیەو لێک جیاوازن، هەروەها هەڵدەکەوێ یەکێک چاک بێ بەڵام زانا و شارەزا نەبێ، بۆ نموونە ئەگەر تۆ لەسازکردنی دەرک و پەنجەرەکاندا زۆر زەحمەت بکێشی و دەغەڵی تێدا نەکەی بەڵام وەستایەکی قابیل نەبی وکارەکەت باش نەیەتەدەر دەتوانین بڵێین ئینسانێکی باش بووی بەڵام وەستایەکی قابیل و شارەزا نەبووی.

**ڕامان گوتی:** راستە، ئێستا بەپروای تۆکێ لەهەموو کەس چاترە؟

**باوکی گوتی:** وڵامی ئەو پرسیارە زۆر سەختە، چونکی پیاوچاکانی رۆژگار ناناسرێن وەک عیلم نییە، ئینسان بەپرسیارێک بۆی دەرکەوێ کابرا چەندی دەزانێ، پیاوچاکی جاری وایە قەت ئاشکرا نابێ، بەڵام دەتوانین بڵێین عیلم زانستە، بەڵام چاکی کردەوەیە، ئێستاش وەک لەخەڵکم زانیوە، ماهان بۆ عیلم و زانست وشارەزایی لەوڵاتی ئێمەدا بێ وێنەیە، بۆ پیاوچاکیش وەک دەڵێن یەکێ لە پیاوچاکانی ئەو رۆژگارەیە.

**ڕامان دەدڵی خۆیداگوتی:** دیتمەوە، ماهان دەتوانێ سوررونهێنی ژیانی پەریانم لێ ئاشکراکا.

پاشان لەباوکی پرسی: ئەرێ ماڵی ماهان لەکوێیە؟

**باوکی گوتی:** هەر لەو شارەی خۆمانەو ماڵەکەشی لەقەراغ چۆمە.

**ڕامان پرسی:** ئەرێ بابە، تۆش ئەو ماهانەت خۆش دەوێ؟

**باوکی گوتی:** پرسیاری سەیر دەکەی! ماهان مایەی سەربڵیندی ئێمەو خەڵکی ئەو شارەیە، ئەو نەتەنیا حەکیم و دەرمانساز و

فەیلەسووف و بەئیمانە بەڵکوو دەڵێن لەزۆر سوڕڕونهێنییان ئاگادارە ودەگەڵ پەریان پەیوەندی هەیە.

ڕامان لەخۆشیان وەخت بوو پڕ بەزاری بقیژێنێ، بەڵام پشوویەکی قوڵی هەڵکێشاو نەرم لە باوکی پرسی: بەڕاستی بابەئەگەر ئەو ماهانەکور یا برای تۆ بایە پێت خۆش دەبوو؟

**باوکی گوتی:** ئەوەچ قسەیەکە؟! ئەگەر ماهان بن ئامۆزای خاڵۆزای زاوای جیرانەکەشـمان بایە هێشتا بۆمن جێی شانازی بوو.

ڕامان سەری بەرداوەو ماوەیەک بێدەنگ ماو سێ چوار خەتی بێ مانای بە سەر کاغەزەکەی بەردەستیدا هێنا و لەناکاو سەری هەڵێنا و گوتی: ئێستا کەوایە وەرە با کارێک بکەین، تا لەو خۆشی و بەختەوەرییە شتێکمان بەنسیب بێ، بمبەلای و دەبەر دەستی ئەوم نێ، تێدەکۆشم هەرچی دەیزانێ لێی فێر بم ئەوکات دە داهاتوودا ئەگەر نەبمەماهانێکی دیکە بەلانی کەمەوە شانازی بەردەست بوونی ئەوم وەگیر دەکەوێ.

**باوکی پێکەنی وگوتی:** بەڕاستی پێم خۆشەکەتا ئەو ڕادەیە هۆگری عیلم و زانینی، بەڵام بەداخەوە ماهان لەبەرکار و لێکۆڵینەوەی بەردەوامی خۆی ماوەی بۆ دەرس‌گوتن نییە، هەموو حەکیمەکان دەکاتی تێگیراوی لەکاری حەکیمانەی خۆیاندا و هەموو زانایان بۆ شیکردنەوەی مەبەستەکانی عیلمی دەچنەلای ئەووپرسی پێدەکەن، ئەو قەت کاتوماوەی ئەوەی نییە دەرس بەمناڵێکی وەک تۆ بڵێتەوە دەنا من لەخوام دەوێ کەتۆ قوتابی ئەو بی.

**ڕامان گوتی:** زۆر باشە خۆ پێویست نییەماهان دەرسم پێ بڵێ، ئینسان ئەگەر بیەوێ شتێک فێر بێ دەبێ گوێ هەڵخا و سەرنج بدا و بیر لەقسان بکاتەوەو لەلای خۆی لێکیان داتەوە.

ئەو ماهانە بەدڵنیایی دەماڵدا زۆر کاری وای هەیەکە بەردەستێک دەتوانێ بۆی ئەنجام بدا، من تەنانەت ئامادەم ببمەکاردار و نۆکەری ئەووگەسکی بۆ لەماڵەکەی دەم و کتێبەکانی بسترمەوە، بەڵێنی دەدەم ئەگەر ماوەیەک ئاوا دەماڵەکەیدا بم هەموو عیلمەکانی لێ فێر دەبم.

**باوکی گوتی:** زۆر سەختە، عەیبی کار دەوەدایەکەماهان پێی خوشەتەنیا بێ و کەس لە کارەکانی حاڵی نەبێ هەرچەند زۆر پیرە

بەڵام بۆ خۆی کارەکانی دەکا، لەوەدەترسێ ئەوەی دەیزانێ وەدەست ئینسانی نا ئەهل کەوێ.

**ڕامان گوتی:** کەوابێ ئەویش بێ عەیب نییە، هەر ئەوەندەی کەزانستی خۆی فێری خەڵک ناکا گەورەترین عەیبە، ئینسانی چاک دەبێ هەوڵ بدا تا ئینسانەکانی دیکە لە زانستی ئەو کەلک وەرگرن.

**باوکی گوتی:** نازانم، ڕەنگە بە بەرژەوەندی یا کەس بەقابیل نەزانێ، هێندێک لە زانستەکان هەن کەزانایان ئەوان لە نائەهلەکان دەشارنەوە لەوە دەترسن دەڕێگەی خراپ و بەزەرەری جەماوەر دەکاری بێنن، ڕامان گوتی: بەکەلکی ئەو پیاوە بەبۆنەی عیلمەکەیەتی و تۆ دەڵێی زۆر پیر بووە، خوا نەخواستە ئەگەر بمرێ تەواوی عیلمەکەشی دەگەڵ خۆی دەباتە ژێر خاک، کەسێک کە ئامادە نەبێ بەزیندوویی سەرئەوشتانەی کە دەیانزانێ فێری خەڵکیان بکا بەدڵنیایی دەکتێبێکیشدا نایاننووسێ تا پاش خۆی کەلکیان لێ وەربگرترێ، هەر بۆیە ئەگەر یەکێ بڕواو بەزیرەکی و وشیاری زانستەکانی لێ فێر بێت، بەقازانجی خەڵک تەواو دەبێ، ئەگەر من بڕۆم و عیلمەکانی فێر بم و پاشان خەڵکی دیکەفێرکەم وڵاتەکەمان دەبێتە سەرتۆپی وڵاتان و پیاوی وەک ماهان زۆر دەبن.

**باوکی گوتی:** قسەکانت جوانە، بەڵام چۆن دەکرێ بچی تا ئەو عیلمانە فێر بی؟

**ڕامان گوتی:** ئەگەر تۆ پێت خوش بێ دەکرێ، تۆ دەڵێی ئەو پیاوە ئینسانێکی باشە، بەڵام بۆ کاری خۆی بەغیلەو پێی خۆش نییە ئەوانەی ئەو دەیانزانێ کەسی دیکە فێریان بێ بەدڵنیایی دڵی ئەو زانایە تۆزە ڕەحم و بەزەیەکی تێدایە، تۆ دەتوانی بچی لای و بڵێی کوڕێکی کەڕ ولاڵم هەیە، چونکی کەڕو لاڵەکەس بۆ کارداری ڕایناگرێ، بۆ خۆشم خەرجی گوزەرانی ئەوم بۆ دابین نابێ، هاتووم دە ڕێی خوادا لەلای خۆت ڕایگری و قاپ وکەچکی پێ بشۆیو وڵاتی پێ گەسک دەیوو نەمر نەژی نانێکی بدەیەی،کیفایەتە، بپارێوە بەڵکوو زگی پێت بسوتێ و ڕامگرێ.

ئەوکات بەکەڕولاڵی لەوێ ڕایدەبوێرم، ئەگەر ماوەیەکی وابم لەوە دڵنیا دەبێ کەگوێم لە هیچ نابێ، ئەوکات دەتوانم بە ئاسانی دە وەختی قسەکردن دەگەڵ زانایان گوێ لە قسەکانیان هەڵخەم وئەگەر دەرفەت بێ کتێبەکانی بخوێنمەوە وئەوەی پێویستم بێ فێری بم.

**باوکی گوتی:** ئەوکارە هەر چەند بە نییەتی خێرەوەیە ئەگەرگوناە وتاوانیش نەبێ، بێت و ئاشکرا بێ ئابڕوی بە هەزار ساڵەمان دەچێ.

**ڕامان گوتی:** مەترسێ، تۆکوری خۆت باش دە ناسی، دەزانم چبکەم تا بە مراد بگەم وببمە زانایەکی گەورە.

**باوکی گوتی:** زۆر باشە وادەکەین، هیوادارم ئاخرمان خێر بێ و پەشیمانی نەکێشین.

ڕامان لە خۆشیان خۆی دە باوەشی باوکی هاویشت و تێروپرماچی کردوگوتی: ئای خوایەگیان زۆر شکور بۆ ئەو بابە باشەی پێت داوم، پاشان ڕوی دە باوکی کرد وگوتی: منیش منالێکی خراپ نیم، قوتابی مەکتەبی ماهان و ڕامانی ئاشقە فێربوونم.

ئەو شەوە جوانیان بیر لێکردەوە و بۆ بە یانی بابی ڕامان ڕۆیشتە مالی ماهان، پاشی دوو سەعاتان بە دڵخۆشی هاتەوە هەواڵی قبوڵ کردنی ماهانی بە ڕامان ڕاگەیاند.

ڕامان لە خۆشیان ئاراوو قاراوی لێ هەڵگیرا بوو، بۆ خۆشی نەیدەزانی چدەکا.

باوکی ڕامان کە دیتی ڕامان دەکەوڵی خۆیدا جێی نابێتەوە، درێژەی بە قسەکانیدا: دەیگوت هەرقیژەوهەرای منالانم پێخۆش نییە، پاشان گوتی ئەگەر بە ڕاستی کەڕ و لاڵ بێ تەنیا بۆ خاتری خوا ڕایدە گرم. منیش تا توانیم تاریفم کردی،گوتم: کورێکی سەنگین و بەشەرم و شکۆی، دە کاراندا زیرەک و وشیاری، بەڵام داخی داخان کەڕ و لاڵی و هەرچی هەوڵم لە گەڵ داوێ فێری خوێندن نەبووی.

**ڕامان گوتی:** بەڵێ ڕامان کەڕە، لاڵە، گێلە، گوێی لە هۆرەی مانگاش نابێ نەخوێندەوارە، قەیدێ ناکا، هەر لە بەر ئەوەی ڕۆژێک ببمە زانایەکی گەورە ئەو قسانەم هەموو قبوڵە، ئەی خوایەگیان چەندە خۆشە! بەڵام بابە، وشیار بە ئەگەر هاتیە سەردانم، نەکەی لێت تێک چی و قسەم لەگەڵ بکەی و ڕیسەکەم لێ بکەیەوە خوری، دەنا ماهان توندگوێچکەم دەگرێ و وەدەرم دەنێ.

**بابی گوتی:** دڵنیا بە من ئاگام لە خۆمە.

**ڕامان گوتی:** ڕاوەستە با کتێبەکەم دەست دەمێ.

**باوکی گوتی:** کتێب؟! کتێب بۆچی؟ بڕیار وایە نەخوێندەوار بی!

**ڕامان گوتی:** ئەو کتێبەی من دەیهێنم بەڵگەیە لە سەر نەخوێندەواریم، چاولێکە، ئەو دەفتەرەشڕو دڕاوەی دێنم، ئەوە تا، ها... ئەو خەتە بێ مانایانەشی پێدا دێنم، ئەگەر ماهان لەو بارەیە دا شتێکی پرسی، دەفتەرەکە لەمن وەرگرە وبە نیشانی دە وبڵێ: پێی خوشە هەرچی من دەیکەم لاسام کاتەوە، چاو ئەو نوسینە بێ مانایەی، چبکەم؟ هەرچیم کرد نەمتوانی فێرە خوێندن و نوسینی کەم، ئەوکات ماهان دڵنیا دە بێ کە من هاڕەی لە یرەی ناکەم، ترسی لێم نابێ و نوسراوە کانی لە من دەقفڵ و هاچەر نانێ.

بابی لە خۆشیان توند ڕومەتی هەڵقورینجاند وگوتی: ئەی زۆرزان، چاک دەزانی چبکەی! ڕامان گوتی: ئامادەم با یرۆین، بەڵام شتێکی دیکە خۆ نێوی منت بە ماهان نە گوتووە؟

**بابی گوتی:** نا هێشتا ناوی تۆم پێ نەگوتووە.

**ڕامان گوتی:** کە وابێ دەبێ ناوەکەشم بگۆڕم، بابی گوتی: ناوەکەت بۆ دەگۆڕی؟

**ڕامان گوتی:** لە بەر ئەوەی، رامان بەگوێم ئاشنایە، دەترسم جارێک بانگم کاو لێم تێک چێ و وەڵامی بدە مەوە، بەڵام ئەگەر ناوم شتێکی وەک ئاشوک بێ، چونکی ناوی خۆم نییە، لێم تێک ناچێ و وەڵامی نادە مەوە.

**باوکی گوتی:** راست دەکەی، ئەگەر پرسی، ناوی خۆتی پێ ناڵێم، پێشم وانییە پرسیاری وام لێ بکا، ئاخر ئەو ناوی تۆی کەڕولاڵی بۆچییە؟

ڕامان و باوکی وەڕێکەوتن، ڕامان هەر لە نیوەی ڕێیەڕا دەستی بە لاساکردنەوەی کەڕو لاڵان کرد و بەلەقاندنی سەر و خوار و خێچکردنی دم و لێو و جوڵاندنەوەی دەست و پێی هەولی ئەوەی بوو هەرچۆنێ بۆی بکرێ ئاکاری لە گەڵ کەڕ و لاڵان جیاوازی نەبێ.،.کاتێ گەیشتنێ، ڕامان بە نیشانەی ئیحتیرام هەر دوو دەستی لە سەر سینگی داناو بەرامبەر ماهان ڕاوەستا، باوکیشی دوای سڵاو، گوتی: کورەکەڕو لاڵەکەی من ئەوەیە، بەتۆی دەسپێرم، هیوادارم لێی ڕازی بی، منالێکی زۆر بێدەنگە، بەناشکوری نەبێ بەو جورەی هاتە سەر دنیا و هەرواش بێ زمان ماوەتەوە، زۆریشم هەوڵ دا فێری نوسینی کەم، بەداخەوە هیچ فێر نەبووە، ئەوە تا لە جێی فێربوونی ئەلف و بێ، ئەو خەتەبێ مانایانە بە دەفتەرە کەیدا دێنێ، باوکی دەفتەرەکەی لە ڕامان وەرگرت و

دای بەماهان وگوتی: ئەو دەفتەرەی زۆر خۆش دەویّ، بەڵام بێفایدەیە هیچ فێر نابێ   ماهان گوتی: زۆر باشە، پاشان قودوی نوقڵانی بۆ ڕامان ڕاداشت، ڕامان نوقڵێکی هەڵگرت وداهاتەوە دەستی ماهان ماچ کا، بەڵام ماهان نەیهێشت.

پاشان ڕووی دەبابی ڕامان کرد وگوتی: تۆ لێرە بە تامن کورەکەت دەبەم و کاری ئەو ڕۆی بۆ دیاری دەکەم، پاشان دەستی ڕامانی گرت و بردێ نێو حەوشە، داسێکی چکۆڵەی دەست دایە ولە بەر چاوی ڕامان هێندێکی لەگیا بڵیندەکان قوڵەکردەوە و پاشان بە ئیشارەوئاماژە ڕامانی حاڵی کرد بەو جورە درێژە بەکار بدا، ڕامان قوڵە داسەکەی لێ وەرگرت و دەست بەکاربوو، ماهان هێندێکی چاو لێکرد کارەکەی بەکەیفێ بوو بەجێی هێشت و رۆیشتەوە ژور، چاوێکی بە دەفتەرەکەی راماندا‌خشاند وگوتی: منالێکی بەهۆشە، ئەلبەت منالی کەڕ ولاڵیش فێری نوسین دەکرێ بەڵام ئەوەکاری تۆ نییە، ئەگەر بزۆزی نەکا و باش سەری خۆی بەرداتەوە و ئەو کارانەی بۆی دیاری دەکەم بە دروستی ئەنجامیان بدا، پاشی ماوەیەکی دیکە فێری بەعزە شتێکی دەکەم، تەنیا تێی گەیێنەکاری منالانە نەکا، چونکی بە ڕاستی من حەوسەلەی منالانم نییە.

یەکەو دوای ئەوە، پیرێژنێکی لادێیی لێرەیە شیووکووڵ و دورمانم بۆ دەکا و چێشتم بۆ لێدەنێ، پێی دەڵێم ئاگای لێی بێ، کارەکانی تایبەتی خۆشی ئەوە بۆ خۆی ئەنجامیان دەدا، باوکی گوتی: بۆ کار، دەهیچ کارێکدا نامێنێتەوە، بۆ ڕەفتاریش تێم گەیاندووە کە لای کێ کار دەکا، هیوادارم شایانی ئەوەبێ کە دەژێر دەستی تۆی زانادا گەورە بێ وبۆ هەمیشە ببینە دوعاگۆتان، با لە مە زیاتر ماوەت نەگرم، ئەگەر ئیزنت لە سەر بێ لە خزمەتت مرەخەس دەبم.

**ماهان گوتی:** وەخت بووو لەبیرم بچێ، ئەی ناوی چییە؟

باوکی گوتی: ناوی؟! قوربان هەر لەمنالێوە ناومان ناوە((ئاشوک)) بەڵام بێچارەیە خۆ بۆخۆشی نازانێ ناوی ئەوەیە.

**ماهان گوتی:** راست دەکەی، ئێستا دەتوانی بڕۆی، هەرکات ویستت بیبینی وەرە ببینە بەڵام دایک وخزمەکانی دیکە ئەگەر وەڕەزیان کرد، وەرە ئاشوکی بەرەوە، با ئەوان نەیەن، چونکی من حەز بەهام و شۆی خەڵک ناکەم.

**باوکی گوتی:** هەرچی تۆ بفەرمووی، پاشان خواحافیزی کرد و ڕۆیشت.

ڕامان خەریکی دروونی گیایەکان بوو لەبەرە خۆیەوە دەیگوت: دەبێ لەبیرم بێ لەمە و دوا من کەڕو لاڵم، دڵنیام بۆ خاترجەمی خۆی تاقیم دەکاتەوە، دەبێ گوێ نەدەمە هیچ وهیچ دەنگوورتە یە کم لێوە نەیە، ئەگەر بانگم کەن دەبێ جواب نە دەمەوە، تەنانەت ئەگەر هەڵیشم هاوەسن دەبێ نوکەم نەیە.

ئەسقەزا ماهانیش دەفکری ئەوەدا بوو بە جورێک تاقی کاتەوە و لە کەڕ بوونی دڵنیا بێ، پەنجەرەی کردەوە، ڕامان پشتی دەپەنجەرە وخەریکی کاری خۆی بوو، دوو جار  هە رای لێکرد: ئاشوک، بەڵام ڕامان بەفیتی خۆی زانیبوو هیچ جوابی نەداوە، ماهان قاپێکی کاشی لە بەر دەست بوو فڕێی دا لە پشتەوەی ڕامان لەعەرزی ڕاکێشا و ورد و خاش بوو، بەڵام ڕامان ئاوڕی نە داوە، ماهان هەرای کرد، کورەئاشوک ئەوە چبوو شکا؟ بەڵام ڕامان سەری بەردابۆوە وخەریکی کاری خۆی بوو.

ئەوکات ماهان بزەیەکی هاتێ و پەنجەرەکەی داخستەوە وگوتی: بێچارە.... مناڵی بێتاوان.... خەریکی کاری خۆیەتی.

کاتێ لە درونی گیایەکان بۆوە، ئەوەندەی دروبووی دەگەڵ لەتکە سواڵە تەکان دەقەرتاڵە یەکی کردن و بردنێ ژور و بە دەست و لێو و چاو لە ماهانی پرسی: ئەوانە بەرمەکوێ؟

ماهان دەگەڵی هات و زبڵدانی بەنیشان دا، لە پاشان ڕامان دەست و پەلی جوان شوشت و گەڕاوە ژور وکپ و بێدەنگ لەگۆشەیەک ڕاوەستا، ماهان دەستی پێکرد بەڵکوو بیخە ڵەتێنێ و قسەیەکی لێ دەرکێشێ.

**ماهان پرسی:** دەی ڕۆڵەگیان ناوت چییە؟ ڕامان چاوی لە ماهان کرد و هیچ وڵامێکی نە داوە، ماهان گوتی: ماندو بووی؟ لە سەر هۆو چوار پایە دانیشە، ڕامان هەروا تێی فکری و لە جێی خۆی نەجووڵاوە، ماهان هەستا و بە دەست حاڵی کرد: لە گەڵ من وەرە، ڕامان وە دوای کەوت، چوونە هۆدەی کتێبان، کتێب لە سەر کتێب هەموو قەفەسەو ڕەفحەکان بەدەیان و سەدان کتێبیان تێدا ڕیزکرابوو، بەڵام تۆزی غەریبی یان لێ نیشتبوو وادیار بوو چەند ساڵ بوو ئەو هۆدەیەکەس بەلایەوە نە چوبو و خاوێن نەکرابۆوە، ماهان دەستی دا کتێبێک و بەکوتە پەڕۆیەک جوان

پێیدا هێنا و تەپ و تۆزی لە سەرلادا و ڕامانی حاڵی کرد کە بەو جورە درێژە بەکاری بدا، پاشان بۆ خۆی کتێبێکی دەست دایەو ڕۆیشتە نزیک پەنجەرە و خەریکی خوێندنەوە بوو.

ڕامان کارەکەی دەست پێکرد، دە پێشدا هەموو کتێبەکانی هێناخوار و سەر ڕەفحەکانی جوان خاوێن کردەوە، کتێبەکانی تەکاند و پاشان حەوت هەشت کتێبی بە سەروبنی لە جێی خۆی داناوە تا ماهان لە نە خوێندەواری ئەو دڵنیا بێ، ئینجا قۆڵی ماهانی کێشا تا بێ و بزانێ باشی داناونەوە یانا؟ ماهان بزەیەکی هاتێ و بەدەست لە ڕوی ژومارەی کتێبەکان تێی گە یاند کە سەروبنی داناون، ڕامان سەرێکی بە نیشانەی حاڵی بوون لە قاند و هەروا کە کتێبەکانی لە جێی خۆی دادە ناوە ناوەکانی دەخوێندەوە، وەخت بوو لە خۆشیان بفڕێ؛ بە سەرهاتی پێغەمبەران، ژیاننامەی سوقرات، دەرمانە ناسراوەکان، هەموو کتێب بوون.

ئەدی باسی نهێنی پەریان دەکوێ دایە؟ چاچاو ئەو خەتەی ناوی ئەو کتێبانەی پێ نوسراوە چەندە ناخۆشە! نەکا ئەوە دەست و خەتی ماهان بێ؟! لای نیوە ڕۆ پیرێژنی کارەکەر لە دەرێ ڕاهات و ماهان بانگی کرد و ڕامانی پێ ناساند وگوتی: ئەو کورەی دەیبینی لە کتێبخانەکار دەکا، لەم ڕۆڕا لێرە دەبێ، ناوی ئاشوکە، بەڵام فایدەی چی،کەڕولاڵە، بۆخۆشی نازانێ ناوی ئەوەیە، دەبێ زۆرت ئاگا لێی بێ، خێرت دەگاتێ دەگەڵی بدوێ بە ڵکوو وەزمان بێ، کارەکانی ماڵێی فێرکە و حەوز و ئەو جێگایانەی پێویستە بەنیشانی دە، پیرێژن چاوێکی لە ژوری کتێبخانەکرد و وەبیری هاتەوە کە ئیزنی چوونی ئەوێی نییە پاشە وپاش گەڕاوە و وەدوای کاری خۆی کەوت، بۆنیوە ڕۆ ڕامانی لەگەڵ خۆی بردە چێشتخانەو هەرچەندی هەوڵی دا نە یتوانی وەقسەی بێنێ، پاش نیوە ڕۆ بە ماهانی گوت: ماشاڵڵا ئەو منداڵە زۆر زیرەک و بەهۆشە، بەڵام بە داخەوە وەک بووکە چینی کەڕوکاسە.

ڕامان رۆژەکانی هەوەڵ چوار چاو وشیاری ڕەفتاری خۆی بوو و لای وابوو کە بەردەوام دە ژێر چاوەدێریدایە، رۆژێک کە خەریکی هەڵوێژاردنی کتێبەکان بوو، یەکیانی لە دەست بەربۆوە و پەڕەکانی بەژورێدا بڵاو بونەوە، زۆری پێ ناخۆش بوو، پەڕەکان ژومارە بەندی نەکرابوون بەڵام دەیتوانی رێک و پێک هەرپەڕەی لەجێی خۆی دانێتەوە،

چونکی دەیزانی دەکتێبەخەتێکانی قەدیمیدا وشەی ئاخری هەر لاپەڕەیەک لە سەرەتای لاپەڕەی دواى خۆیـنوسراوە، ڕامان ئەگەر ئەوکارەی کرد با، دەزانرا کە خوێندەواری هەیەو وەدرۆ دەکەوتەوە ناچار بەلاڵە پەتەیی خۆی گەیاندە ماهان و ملی نا لەگریان و بەدەست نیشانی دا کە چ دەستەگوڵێکی بە ئاو داداوە.

ماهان نێو چاوانی لێ تێک ناو ئیشێکی لە پشت ملی داوگوتی: ئەگەر جارێکی دی وا شڵەپەتە بێ وکاری وا بکەیەوە پیلت دەگرم لەو ماڵەت وەدەر دەنێم.

ماهان کە دەستی بۆ دەرکەی دەرێ ڕا داشت، ڕامان بەپەلە بۆلای دەرکە ڕایکرد و چاوی لە دەرێ کرد وبەوکارە نیشانی دا کە لە قسەی ماهان حاڵی نەبووە، ماهان دانیشت و پەڕەکانی کۆ کردەوە، ڕامانیش یاریدەی دا، ماهان هەروا لە بەرە خۆیەوە دەیبۆڵاند: چاچاو، ویستمان کارێکی خێر بکەین! بەڵام کاتێ چاوی بە چاوە پڕفرمێسکەکانی ڕامان کەوت، زگی پێی سووتا، دەستێکی بە سەرو شانیدا هێنا و گوتی: دەی قەیدێ ناکا، خەمێ مەخۆ، بەڵام بۆ جارێکی دیکە ئاگات لە خۆت بێ، لە پاشان هەروا لە بەرە خۆیەوە بۆڵاندی: جا فایدەی چی، خۆ هیچ گوێی لەو قسانە نابێ.

تا چەند ڕۆژی دیکە جامەگین کارێک پێش هاتبا، دەنا ڕامان دەکتێبخانە دا خەریکی ڕێک و پێککردنی کتێبەکان بوو، دە وماوەیە دا ماهان و پیرێژنی کارەکەر لە کەڕو لاڵ بوونی ڕامان بەتەواوی دڵنیا ببوون، بەڵام ڕامان حەجـمانی نەبوو وچرکەساتێکیش  خۆی بێکار نە دەکرد، چ ئەو کارانەی پێیان سپاردبا وچ ئەو کارانەی ئەقڵی پێی شکابا، ڕێک و پێک و بە مشوور ئەنجامی دە دان، قاپەکانی دەشوشت، وڵاتی گەسک دە دا، کتێب و ئەسبابەکانی دیوی مامۆستای دەتەکاند و جامەکانی بۆ پڕ لە ئاو دەکرد، بە نیشانەی بەجێگەیاندنی ڕێزو ئیحترام چەند هەنگاو لە پشت سەری مامۆستا بەڕێدا دەڕۆیشت، دەیزانی چ وەخت نان بخوا و چکاتێ بنوێ وکەنگێ لە خەو هەستێتەوە، تەنیا کارێک کە نەیدەکرد و دەبەرنامەیدا نەبوو گوێدان بوو، ئەگەر کەسێک هێندەی لە دەرکە دابا لە ڕێسمەی هێنابا دەر، ئەو نەیدەبیست.

کاتێ ماهان و پیرێژن قسەیان دەکرد، مەگین بە دەست حاڵیان کردبا دەنا خۆی وانیشان دەدا کە هەر لە تاقە قسەیەکیش حاڵی نەبووە،

وەختایەک خۆی کردە کەڕێکی حیسابی وردە وردەکارەکانی بۆ جێبەجێ بوو.

ڕۆژەکانی هەوەڵێ هەرکات یەکێک هاتبا، ماهان ڕامانی دەناردە دەرێ، بەڵام وردە وردە لای خۆی دەیهێشتەوە،ڕامان قڕو قپ لە گۆشەیەک ڕادەوەستا، ئەوانەی دەردێکیان بایە بەماهانیان دەگوت و ماهانیش ڕێی چارەی بە نیشان دەدان، ڕۆژ بە ڕۆژدەردی خەڵکی پتر دەزانی وزیاتر لەکارە عیلمییەکانی ماهان حاڵی دەبوو، بەڵام هەر هیچ وەسەرخۆی نەدێنا، خەڵک دەهاتن دەرمانیان دە ویست، وتووێژ و پرس و ڕایان پێدە کرد، ئەگەر گرفتێکیان دەژیاندا بۆ پەیدا بوبا بۆ لەناو بردنی ئەو گرفتە داوای یارمەتییان لێ دەکرد، بە ڕاستی ماهان پیاوێکی تێگەیشتو و دە هەموو بارێکدا شارەزا بوو، بە ئەهوەنی و لە سەرخۆیی وەڵامی هەموویانی دەداوە، سەرەڕای ئەو هەموو کارانە دەستێکی باڵای دەحەکیمایەتی و سازکردنی دەرمانەکاندا هەبوو،گەورەترین کارێک کە ڕامان دە و ماوەیەدا لە ماهان فێر بوو ناسینی دەرد و نەخۆشێکان و شێوەی سازکردنی دەرمانەکانیان بوو.

ڕامان بەردەوام وەک بەردەستێک دەوەتاغی ماهان دا بوو، ئەو کارانەی کە دەبوو بە دەست ئەنجامی دابان لەوێ و ئەوانەی پەیوەندییان بە عیلم و زانستەوە بوو لە ڕوی کتێبەکان فێریان دەبوو.

خۆشترین کات بۆ ڕامان ئەوکاتانە بوون کە ماهان بۆ دیتنی نە خۆشێک دەڕۆیشتە دەرێ، دەوماوەیەدا بە ئازادی خەریکی خوێندنەوەی کتێبەکان دەبوو، بەڵام ئەو شتەی ئەو بە دوایدا دەگەڕا، یانی کتێبێک بەناوی ((ڕێگەی ئاشنایی دە گەڵ پەریان)) بەرچاوی نەدەکەوت، جگە لە کتێبەکان سێ یە غدانی داخراو لەگۆشەی کتێبخانە دانرابوون،کە ماهان هەربۆخۆی ئەگەر کارێکی پێبان دەیکردنەوە و پاشان دایدەخستنەوە، ڕامان پێی وابوو هەرچی سورونهێنییەدەوسندوقانەدایە.

باوکی ڕامان مانگێ جارێک دەهات و بە ئیزنی ماهان، بۆ دیتنی دایکی دەیبردەوە ماڵ.

هەموو جارێ کە دەهاتە دەر باوکی لێی دەپرسی: دەی ڕۆڵەگیان چۆنی؟ ڕامان هەروا قڕو قپ دەماوە و وەڵامی نەدەداوە، باوکی ناچارباسکی ڕادەتڵەکاندودەیگوت: کورە بۆ جواب نادەیەوە مەگین کەڕی؟!

ئەوکات ڕامان وشیار دەبۆوە و پێدەکەنی و دەیگوت: ببورە بابەگیان، دە پێشدا سەلاموعەلێک، زۆر باشم، بەڵام بەسەری تۆ ئەوەندەم لاسای کەڕولاڵان کردووەتەوە وەختە بڵێم قسەکردنم بیر چووەتەوە.

هەموو جاران کە ڕامان دەهاتەوە ماڵ جار لە جار پتری دەزانی، ئەوجەوهەر و دەرمانانەی بە چاولێکردن فێریان ببوو، لە ماڵێ سازی دەکردن و لە هەمووی گرینگتر ئەگەر یەکێک لە خزمان نەخۆش با،دەرمانی ڕامانی دەکار دەکرد و وەک گوێزی ئازای لێدەهاتەوە، خزمانیش تەواو لە وەی کەیف خۆش بوون کە ڕامان دەوتەمەنەکەمەیدا بەو ئەندازەیە دەپزیشکیدا شارەزایە.

ماوەیەک ڕابرد، هێندەی کتێبی پزیشکی خوێندەوە وکارەکانی ماهانی بۆ چارەسەرکردنی نە خۆشێکان چاو پێکەوت ڕێبازی ژیانی گۆڕا.

ئەوکە دەپێشدا بە شوێن دۆزینەوەی زانیاری لە بارەی پەریاندا لە ماڵی خۆی هاتبوو دەر، وردە وردە چوار چێوەی ماڵی ماهان شوێنی لە سەر دادە ناو دە بوو بە حەکیمێکی قابیل و لێزان، خۆشترین هەل بۆ ڕامان ڕۆژێک بوو کە ماهان ناچار بوو بۆ ئەنجامی کارێکی گرینگ سەفەرێکی چەند ڕۆژە بکا، پیرێژنی ڕاسپارد دە وماوەیە دا کە لە ماڵ نییە، دەرکە لەکەس نەکاتەوە، پاش ڕۆیشتنی ماهان پیرێژن بۆ خاترجەمی خۆی دەرکەی لە ژورێ ڕا دادەخست و دەڕۆیشتە نێو ژورە کەی خۆیو لە بەر وەڕەزیان ڕۆژ تا ئێوارە خەونوچکە دەیبردەوە،کاتی ژەمەکانیش خۆراکێکی ئاسایی ساز دەکرد و وێڕای ڕامان دەیانخوارد و سەر لە نوێ بێکار دە مانەوە.

ڕامانیش هێندێکی خەت بە دەفتەرەکەیدا دێنا وخەونوچکەی دێنا خۆی تاوەکوو پیرێژن بە جێی دە هێشت، هەرکە پیرێژن دەڕۆیشت ڕامان خۆی دەگەیاندە کتێبخانە و ملی لە خوێندنەوەی کتێبە نایابەکان دەنا، خۆشترین ڕۆژ بۆ ڕامان ڕۆژی دووهەمی سەفەری ماهان بوو، دەکاتی وڵات خاوێنکردنەوە داکلیلی سندوقەکانی دیتەوە، پێی وابوو ئەوانەکلیلی بە هەشتێن، لە خۆشیان ماوە یەک بەخۆیەوە گوشین لە پاشان لە بەرە خۆیەوە گوتی: تازە ئیدی خەو بەکار نایە، شەو دوای ئەوەی نانیان خوارد خواخوای بوو زوتر پیرێژن خەوی بێ و پرواو بنوێت، ئەوماوەی بە ساڵێک لێ گوزە را، بە رامبەر پیرێژن دانیشت و بەقەستی

خۆش خۆش باوێشکی دێنا خۆی، ئاخری پیرێژنیش باوێشکێکی هاتێ و بۆ نوستن ڕۆیشته دیوەکەی خۆی.

هەرکە پیرێژن ڕۆیی، ڕامان بە ئەسپایی خۆی گەیاندە کتێبخانەو دە پێشدا پەردە ئەستوورەکانی پەنجەرەی داداوە، پاشان شەمێک کە دە پێشدا ئامادەی کردبوو هەڵیکرد و ناوی خوای هێناو سەری سندوقێکی کردە وە، کە تێیروانی جگە لە چەند کتێبی خەتی وچە ند کتێبی کۆنی لە بەرێک بڵاوبوو هیچی دیکەی تێدا نەبوو، بەڵام ماهان حەقی بوو ئەوکتێبانە ئاوا توند دە قفڵ و هاچەر نێت، دە ڕاستیدا ئەوانە بەرهەمی ساڵەهای ساڵ ئەزموون و تاقیکاری بوون، ڕامان دەو چەند شەوەدا ئەوەندەی کە لەو کتێبانە کەلک وەرگرتبوو تەنانەت دەپێشدا بە خەیاڵیشیدا نەهاتبوو.

لە هەمووی خۆشتر ماهان دەفتەری بیرەوەرێکانیشی کە زۆربەی نهێنێکانی ژیانی خۆی دە وێدا نوسیبوو دەوسندوقەی نابوو، مەعلوم نەبوو ماهان ئەوانەی بۆ نوسیوە؟ ڕەنگە لە بەر ئەوەی بووبێ کە دوای مردنی شوێنەوارێک لە خۆی بە جێ بێڵێ، دەی بۆچی شاردونێوە؟ ڕەنگە بەتەمابێ دە دەرفەتێکی لە باردا رێک و پێکیان کاو کتێبێکیان لێ سازکاکە شیاوی مانەوە بێ، ڕامان بە خوێندنەوەی ئەو بیرە وەریانە تازە تێگەیشتبووکە ماهان چەندە ئینسانێکی گەورەیە، دەو نوسراوانەدا دە بارەی زۆر کەس و کار و ڕوداوو بیرو باوەڕی خەڵکدا دووابوو کە بە پروای ڕامان هەموویان دروست وجێی سەرنج بوون.

دەوماوەیەدا ڕامان بە شەو خەریکی خوێندنەوە و مەبەست دەرهێنان بوو وبەر لە بەیانی سندوقەکەی وەک خۆی دادە خستەوە وشەمەکەی دەکوژاندەوە و پەردەکەی لادە دا و دەڕۆیشتەوە ژورەکەی خۆیو دە جێی دەخزا، هێشتا تەواو چاوی گەرم دانەدەهات پیرێژن وەژور دەکەوت و ڕایدەتڵەکاند و هەڵیدەستاند، ڕامان لێو بەبزە و بە ڕویەکی خۆشەوە چاوی هەڵدێنا و بە زمانی بێ زمانی سپاسی لە پیرێژن دەکرد، جاری وا ڕەفیق وهاورێی تەنبەڵ ئەو جورە قازانجانەی هەیە، دەنا خۆئەگەر پیرێژن وەک کەروێشک هێندەی خەو پێخۆش نەبایە کەنگێ ڕامان دەیتوانی خۆی بگەیێنێتەسەرچاوەی زانینی ماهان ومێشکی خۆی لێ پاراو کا؟

دەو ماوەیەدا ڕامان کتێبی سندوقێکی خوێندنەوە و بە ئەندازەی پێویست لە ڕویان شتەگرینگەکانی نوسێوە.

کاتێ ماهان لەسەفەرگەڕاوە ڕامان بۆ ئەوەی نیشانداکە چەندە لە گەڕانەوەی دڵخۆشە بە غاربەرە وپیری چوو دەستی ماچ کرد، بەڵام دە راستیدا دڵخۆشی ڕامان لەو سەفەرە بە جێیەی بوو کە ئەو هەلەی بۆ پێک هێنابوو، ماوەیەکی زۆرگوزەرا بەڵام ڕامان هەلی وای بۆهەڵنەکەوتەوە تا دەستی وەکتێبەکانی سندوقی دووهەم ڕابگا، لەو لاوە دیتی هەموو کارەکانی ماهان فێر بووە، تەنیا ((رێگەی ئاشنایی دەگەڵ پەریان)) مابوو کە هیچی دەبارەدا نەدەزانی و دە کتێب و دەسنوسەکانی ماهانیشدا هیچی دەوبارەیە دا بەرچاو نەکەوتبوو، دە وتووێژی میوانانیشدا دەگەڵ ماهان نە یبیست کەس دەو پێیەدا قسان بکا.

بیری کردەوە، دەبێ فێڵێکی بکەم، دەبێ بۆم دەرکەوێ کە ماهان دە و بارەیە دا چدەزانێ؟ دەی چبکەم؟ چۆنی وە قسەبێنم؟

رۆژێک کە دەگەڵ بابی گەڕاوە ماڵ، دەوبارە دا دەگەڵ پوری کەوتە وتووێژ.

پورێ گیان، دەزانم دوای دایک و باب و خوشک و برا، خاڵ و پور و مام لە هەموو کەس لە بنیادەم نزیکترن، ئێستا دە مەوێ بەو مەرجەی بەگوێی بابم نەگاتەوە شتێکت لێ بپرسم.

پوری گوتی: زۆرراستە، پیاو ناتوانێ هەموو شتێک لە دایک و بابی بپرسێ، خەڵکی غەریبەش زۆرجێی پروا نین، جا قەزات وەمن کەوێ بپرسە وهیچ ڕووبینی مەکە.

ڕامان گوتی: راستێکەی ئەو ماهانە زۆربەی کارەکانی بە یارمەتی وەرگرتن لە پەریان ئەنجام دەدا، منیش ناتوانم دەو بارەیەدا هیچی لێ بپرسم، ماهان هەنگوینی زۆر پێخۆشە، دەمەوێ بێیوو کوپەڵە هەنگوینێکی بۆ بێنی ورێگەی ئاشنایی دەگەڵ پەریانی لێ بپرسی.

پوری گوتی: قەزات لە من، جا ئاخر من چۆن بێم و ئەوەی لێ بپرسم؟

ڕامان نەخشەیەکی کێشا و پوری جوان تێگە یاند و بڕیاریان دانا دوو رۆژ دوای چونەوەی ڕامان پوری بێ و پرسیارەکەی لە ماهان بکا و وڵامەکەی وەگیرکەوێ.

دە رۆژ وکاتی دیاری کراودا لە سەر نەخشەی ڕامان، پوری بەکوپەڵە هەنگوینەوە هات و گوتی: ئەی مامۆستا و حەکیم و گەورەی لێزان ئەم

شەو خەونێکی سەیرم دیوە، هاتووم دەو پێیەدا ڕێنوێنیم بکەی، دەو خەونەمدا پەرییەکی دەریایی بە ئاسماندا هەڵدە فڕی، چەندساڵە بە شەو چاوەکانم چاک نابینن، دە وخەونەدا فکرم کردەوە کە ئەو پەرییە شفام دەداو چاوەکانم چا دەکاتەوە، بانگم کرد، بەڵام وڵاممی نەداوە، پاڕامەوە، زگی پێم سووتاوگوتی: ئەگەر دە تەوێ چارەی دە ردت بکەم دەبێ بڕۆی کوپەڵە یەک هەنگوینی خاوێن بۆ ماهان بەری لەوت بوێ ڕێگەی ئاشنایی دە گەڵ منت پێ دەڵی، پاشان دە چاو تروکانێکدا ون بوو من وەخەبەر هاتم.

ئێستا هاتوومە خزمەتت، بزانم چ دەفەرمووی؟ من چبکەم؟ دەوکاتەداڕامان لە قولینچکی ژورخەریکی پاڵاوتنی شەربەتێک بوو کە ماهان سازی کردبوو بە جوانی قسەکانی دەبیست.

ماهان دە وڵامدا بزەیەکی هاتێ وگوتی: فکر و خەیاڵات هۆی دیتنی ئەو جورە خەونانە یە، لەوانەشە شەو دە خواردندا هێندێکت زیادە خۆری کردبێ، شەوانە تۆزێ  کە متر بخۆ با خەونی وا هاڵۆز نەبینی، بەڵام دە رمانی چاوت دەو شووشەیە دایە، شەوانە بەر لە خەوتن دوو دڵۆپی دەچاوت کە، بۆ ئەو دیارییەی هێناویشتە زۆر سپاست دەکەم، پوری کە دەیزانی بۆچی هاتووە،گوتی: ئەی قوربان خەونەکەم و پەری دەریایی چیان لێدێتەوە؟ بۆخۆی گوتی: بێمە خزمەتت، ئەدی چۆنم ڕێنوێنی دەکەی؟

ماهان گوتی: دەرمانی چاوی تۆ دەو شووشەیە دایە، من حەکیمێکی بەناوبانگم، بە دڵنیایی دە پێشدا ناوی منت بیستووە، فکرت کردووەتەوە بێیەلای من و دەرمانی چاوت لە من بوێ، پاشان بە خەونیش شتێکت دیوە، ئیدی ئەوە دەخلی بە سەر منەوە نییە و پێم خۆش نییە زیاتر دە و بارەیە دا بدوێم.

پوری ئیدی نە یزانی چ بڵێ، ناچار سپاسی لێکرد و ڕۆیشت و ڕامان تێگەیی کە ماهان بە هیچ جور دەبارەی پەریاندا نادوێ، بەڵام ڕامان زۆر لەوە ژیرتر بووکە بەو ڕوداوە ناڕەحەت بێ و لە مەیدان بچێتە دەر، ئەو پێویستی بەخەون و خەیاڵ نە بوو، بەڵام پێی خۆش بوو هەرچۆنی بێ لە و نهێنییە ئاگادار بێ، بەڵام بە داخەوە دیسان نە یتوانی.

لە ناکاو ڕۆژێک شتێکی سەیر ڕوویدا، بەیانی زوو لە ماڵی حاکم ڕا بە دوای ماهاندا هاتن و گوتیان: کچی مەهاڕاجا زۆر نەخۆشە، بێت و زوو

دەفریای نەیەی لە وانەیە خوا نە خواستە ڕوداوێکی دڵتەزێن بقەومێ، ئەسقەزا ئەو ڕۆژە ماهان بۆ خۆی ساغ نە بوو بەڵام ناچار بوو بچێ و ئەو نەخۆشەی ببینێ.

دەو دوایانە دا ماهان جاروبار بۆ دیتنی نە خۆشان ڕامانی دەگەڵ خۆی دەبرد و کیفی دەرمانەکانی پێ هەڵدەگرت، بەڵام ئەو ڕۆژە مەعموورەکان کیفەکەیان بۆ هەڵگرت و ڕامانیان دەماڵدا بەجێهێشت.

ڕامان لەوەی کە دەگەڵ خۆیان نەبرد زۆری پێ ناخۆش بوو دەباڵ خۆیدا گوتی: دەبێ ئەوە چ نەخۆشییەک بێ کە حەکیمی تایبەتی حاکم نەیتوانیوە چاری بکاو ناچار بە دوای ماهانیاندا ناردووە؟

دەبێ ماهان چۆنی چارە بکا؟

ماوەیەک دوای ڕۆینی ماهان پیرێژنیش لە ماڵ ڕۆیشتە دەر و دەیزانی کە تا نیوە ڕۆ ناگەڕێتەوە، هەرچی کردی خۆی بۆ ڕانەگیرا، بەپەلە غاری دا دیوی پیرێژن و کەوشەکانی ئەوی کردە پێیو چارشێوەکەی بەسەر خۆیداداو یەکڕاست ڕۆیشتە ماڵی حاکم، دڕی بە ژنان داو بە زەحمەت خۆی گەیاندە سەر نەخۆشەکە،کاتێ گەیشتێ ماهان تازە خەریکی چاولێکردنی بوو، نەخۆشی کچی حاکم بۆ ڕامان ناسراو بوو، دەکتێباندا دەبارە یدا خوێندبوویەوە وزۆرجاریش ماهانی دیبوو کە چارەی ئەو نە خۆشییەی کردبوو، ماهان برینەکەی خاوێن کردەوە ومەڵهەمی لە سەر دانا، ڕامان دیتی، ماهان واخەریکە نەخۆشەکەی دە وحاڵەدا بە جێ بێڵی، لە حاڵێکدا دڵنیا بوو کە ئەگەر ئەو کچە بەو جۆرە ماباوە، تا شەو پشووی لێدە یرا و دەخنکا.

زانی کە لە بەر نەخۆشی خۆی نەخۆشی کچی حاکمی بۆ نە ناسراوە، ناچار خۆی بۆ ڕانەگیرا و لە ماهان نیزیک بۆوە و بە سرتە پێی گوت: قوربان دەرمانی(خانە زیلت) باش دەکارکرد، لام وایە چاوێک لە نێوگەروی کەی زۆر باش دەبێ، چونکی زیاتر لە بەر دوشاخەی نارەحەتە،ماهان بێ ئەوەی سەر هەڵێنێ چاوی لە نێوگە روی نەخۆشەکە کرد وگوتی: ڕاست دەکەی! وەخت بوو بەهەڵە بچم ، زۆر پیر بووم و بە داخەوە ئەوڕۆش ساغ نیم، تۆهەرکەس هەی فریشتە یەکی کە خوا بۆ نەجاتی گیانی ئەوکچەی ناردوی، یاخوا ڕۆڵە بەبەخت و مراد بی.

گیانی کچە دە مەترسیدا بوو، ماهان بێ ماتڵ بوون خەریکی دەرمان بوو، ژنی حاکم ئەو قسانەی گوێ لێبوو، بەڵام ڕامان لە بیستنی قسەی ماهان، چاوەکانی پڕ بوو لەفرمێسک، ئیدی کاری نەمابوو بە پەڵە لە وەتاغەکە ڕۆیشتە دەر، تا بەر لە گەڕانەوەی ماهان خۆی بگەیێنێتەوە ماڵ.

ژنی حاکم وەدوای کەوت و بەر لە وەی پێی بنێتە دەرێ، توند باسکی گرت وگوتی: بڵێ بزانم کچی کێی؟ من دەبێ تۆ بناسم، تۆ بووی کە نەخۆشی کچی منت ناسی.

ڕامان کە هەروا دم و چاوی بە چارشێوەکە داپۆشیبووگوتی: تکات لێدەکەم لێم گەڕێ، ناسینی من هیچ کە لکێکی بۆ تۆ نییە، بۆخۆت پیاوەتی وگەورەیی ماهانت چاو پێکەوت کە چەندە زوو قسەی حەقی سەلماند، لێم گەڕێ با بڕۆم.

**ژنی حاکم گوتی:** ناکرێ، تا نەتناسم ناهێڵم بڕۆی، ئەگەر دە تەوێ ماهان نەتناسێ، زۆر باشە لەویت ئاشکرا ناکەین.

بەڵام تۆکەگیانی کچی منت لە مەرگ نە جات داوە، دە بێ بتناسم، ئەگەر بێت و پێ بچەقێنی و نەڵێی کێی، ڕاگیرت دەکەین و ناهێڵین بڕۆی.

**ڕامان گوتی:** نانا ئیدی ئەوە خراپترا، ئەوەی بزانە من بەردەست وقوتابی ماهانم و هەرچی دەیزانم لەوی ڕایە، ماهان نابێ بزانێ، نامەوێ خەمێ بخوا، ئاخر ئەو وادە زانێ من کەڕولاڵم، تازەکچیش نیم کورم! چارشێوم بە خۆم داداوە، بە دزی هاتوومە ئێرە تا شتێکی تازە فێر بم، ئیدی نەمدە زانی هاتن و قسەکردنم ئەوەندە بە قازانج تەواو دەبێ، تکا دەکەم ماهان ئەرکی باوکێتی بە ستۆی منەوە هەیە ئاشکرام مەکە.

ژنی حاکم گوتی: زۆر باشە، ناسیمانی، ئێستا دەتوانی بڕۆی، بەڵام ئێمە تۆ فەرامۆش ناکەین.

ڕامان بەپەلە خۆی گەیاندەوە ماڵ، ماهانیش دوای سەعاتێک هاتەوە، بەڵام لە بەر ناڕەحەتیان ئەو ڕۆژە چاوی لەکەس نەکرد، شەو دەفتەری بیرەوەرێکانی لە سندوق هێنا دەر و شتێکی تێدا نووسی و دەجێی خۆی ناوە وسندوقەکەی داخستەوە.

دوو ڕۆژ دوای ئەو ڕوداوە ڕامان هەلی بۆ هەڵکەوت تا دەفتەری بیرەوەرێکانی مامۆستای بخوێنێتەوە، ماهان نوسیبووی: چەند ڕۆژە

شتی زۆر سەیر لە دەورو بەری من ڕو دە دا، ئەورۆ کچی حاکم نەخۆش بوو، هەرچی تێفکریم و هەوڵم دا نەخۆشی ئەوکچەم بۆنەناسراو دە دەرمان کردنیدا بەهەڵە چووبووم،کچێک لە نێو ئەو ژنانەی لەوێ بوون هات و لەو هەڵەی وشیاری کردمەوە، تا ئەوکات قەت هەڵەی وام نەکرد بوو، پاشان کە هەواڵی ئەوکچەم پرسی و وەدوای کەوتم کەس نەیدە ناسی و بۆیان نەدۆزراوە، دەتگوت هەر لەوێ غەیب بووە، هەرچی بوو فریشتەیەک بوو کە خوا بۆ نەجاتی گیانی ئەو نەخۆشە نارد بووی.

چەند رۆژ لە مەو بەریش ژنێک هاتبوو لە بارەی ئەو خەونەی کە بە پەریانێوە دیبووی لە منی پرسیارکرد، ئێستاش نەمزانی ئەو ژنە چۆن زانیبوی من هەنگوینم پێ خۆشە!؟

دەکاتێ لاویمدا بۆ دیتنی پەریان زۆرم ڕەنج و چلەکێشی کرد بەڵام بە داخەوە هیچیان لێ تێ نەگەیشتم، بڵێی ئەوکچە،کچی شای پەریان بووبێ و هاتبێ جوابی ڕەنجەکانی زەمانی لاویم بداتەوە؟ ئەگەر ئەو نەبووە ئەی کێ بوو؟

لە نێو ئەو ژنانە ڕاهات و ئاوا سووک و هاسان ئەو نەخۆشییەی ناسی، تێ ناگەم، وەختە شێت بم، بریا خۆی لێ ئاشکرا کردبام، بە دەستیدا نوسابام و بە مامۆستای خۆمم قبوڵ کرد با، ئەگەر کچی شای پەریان بوو، بۆ دە وتەمەنە دا بە سەری کردوومەوە؟

خۆزگە دیسان هاتباوە، بریا بەر لە مردن دە ورازە گەیشتبام.

کاتێ رامان ئەو نوسراوەی خوێندەوە گوتی: دەی دەی، کچی شای پەریان شتێکەکە تەنانەت ماهانیش هیچی دەبارە دا نازانێ، ئێستا کە کار گەیشتووەتە ئێرە، باش وایە خۆم لە ماهان ئاشکرا کەم، نازانم چبکەم؟ بەڵام چابوو دە و ڕاستییەگەیشتم کەکچی شای پەریان شتێکە خەڵک دەفکرومێشکی خۆیاندا سازیان کردووە، من بووم پورم نارده لای ماهان، من بووم دەردی ئەوکچەم ناسی، تازە ئەوەی کوتیشم لە خۆی فێر ببوم ، کەوایە من وماهان کچی شای پەریانین و ئیدی هیچی دیکە دە گۆڕێدا نییە.

ڕامان چەند ڕۆژ بیری کردەوە، بەڵام وەختایەک دیتی ماهان زۆر نیگەران و ناڕەحەتە و بەردەوام دەفکردایە وکچی حاکم بەدەرمانەکان چابووەتەوە، بڕیاریدا خۆی لە مامۆستای ئاشکراکا.

بەیانی زوو کە پیرێژنی کارەکەر هات ڕامانی لە خەو هەستێنێ، ڕامان سڵاوی لێکرد، پیرێژن لە ترسان پاشەو پاش کشاوە، ئەو جار لە ڕامان نزیک بۆوەو بە سەرسوڕماوی گوتی: ئاشوک ئەوە چ دەبیسم؟! زمانت کراوە تەوە؟

ڕامان گوتی: ئەم شەو پەری هاتن دەخەونمەوە من وەقسە هاتم. پیرێژن بێ ماتڵ بوون ڕایکردە لای ماهان و ئەو هەواڵە خۆشەی پێدا، ماهان بە سەرسوڕماوی گوتی: ئەو ڕۆژانە شتی سەیر سەیر دەقەومێ، گورج کە بانگی کە.

ڕامان هات و بە زمانێکی خۆش گوتی: ئەی مامۆستای بەڕێز، سپاست دەکەم بۆ ئەو هەموو چاکانەی کە دەگەڵ منت کرد، بەڕاستی تۆ ئینسانێکی گەورە وهەڵبژاردەی.

ماهان بە سەرسوڕماوی جوابی سڵاوەکەی داوە و بە زمانێکی خۆش وەک بابێکی باش گوتی: هێندەی عەرزوعاسمان لەوەی کە دەتوانی قسان بکەی دڵخۆشم، بڵێ بزانم زمانت چۆن کراوە؟

ڕامان گوتی: ئەی مامۆستای بە ڕێز نازانم قسەی راستت بۆ بکەم یا بە درۆ وەڵامت بدەمەوە؟

**ماهان گوتی:** رۆڵەگیان ئەوە چ قسەیە کە؟ من لە درۆ بێزارم، ئەڵبەت کە وەڵامی ڕاستم لە تۆ دەوێ.

**ڕامان گوتی:** مامۆستا گیان بۆ ئەوەندە ماوەیەی کە دەماڵی تۆدا بووم بۆ هەمیشە دەستە و دوعات دەبم، بەڵام نهێنییەک لە من ئاشکرایەکە تۆ لێی بێ هەواڵی، من کچی شای پەریان دەناسم، ئەگەر دڵنیا بم لێم توورە نابی ئامادەم ئەوت پێ بناسێنم.

**ماهان گوتی:** جا بۆ توورە دەبم؟ بەڵام تۆ چۆناو چۆنی دەناسی؟ بەخەون دیتووتە؟ بڵێ بزانم، زۆرم پێخۆشە دەو نهێنییەی بگەم.

**ڕامان گوتی:** نە خێر قوربان، خەونی چی! من ئەوەم بە زیندوویی ناسیوە، بەڵام زانینی ئەو نهێنییە شەرت و مەرجی هەیە، دەبێ بەڵێنیم پێ بدەی لێم توورە نەبی و لە تاوانم چاو پۆشی بکەی و هەروەکو جاران بە بەردەستی خۆت ڕامگرێوە و لە چاکەی خۆت بێ بەشم نەکەی، ئەوانە مەرجی زانینی ئەو نهێنێیەن.

**ماهان گوتی:** بەڵێنیت پێدە دەم، ئاخر من خراپەیەکم لە تۆ نەدیوە، ئەگەر خراپەیەکیشت کردبێ و نەمزانیبێ بەو شەرتەی راستێکەی بڵێی چاوپۆشیت لێدەکەم.

ڕامان لە خۆشیان پێکەنی وگوتی: خوا شکور ئەوە هەموو شتێک جێ بە جێ بوو، بەڵێنی سەرزارەکی تۆ بۆ من هەموو شتێکە، پێویستە بزانی ئەو کچەی کە هات و نەخۆشی کچی حاکمی ناسی قوتابی فێرگەی خۆت بوو.

ماهان بە سەرسوڕماوی گوتی: پێم شک نایە قەت شتێکم بەکچێک فێرکرد بێ!

**ڕامان گوتی:** ڕاوەستە با کچێکی وەک ئەو کچەت بۆ سازکەم ئەو کات هەموو شتێکت لێ ڕون دەبێتەوە، ڕامان ڕۆیشتە دیوی پیرێژن کەوشەکانی کردە پێیوو چارشێوەکەی بە خۆیدادا وگەڕاوە لە ماهانی پرسی: ئایا کچەکە ئاوا بوو؟

**ماهان گوتی:** ئا، پرێک، ئەو شێوەی دە دا.

**ڕامان گوتی:** قوربان، پرێک نا، ئەوکچەی هات و ئەو قسەی کرد دروست ئەوانەی دەبەر دا بوو پێت وانە بێ لە ئاسمان ڕاهاتبووخوار، قوربان لێم ببوورە، من بووم هاتم و ئەو قسەم کرد، هەرچی دەیزانم لە تۆی دەزانم، ئەو ڕۆژە ژنی حاکم ئەو مەبەستەی زانی، بەڵام لە بەری پاڕامەوە ئاشکرام نەکا، لە وەی ترسام لێم ڕە نجێی.

**ماهان گوتی:** باشە، زمانی تۆ لەکەنگێوە کراوەتەوە؟ بۆ دە پێشدا ئەو هەواڵە خۆشەت پێ نە داوم؟

ڕامان کوڵی گریانی دەئەوکی وەستا وگوتی: ئەی بابی بەڕێز، یەکەم جار بۆ ناسینی ڕێگەی ئاشنایی دە گەڵ پەریان پێم دەو ماڵە نا، خۆم کەڕ و لاڵ کرد تا هەر چۆنی بێ لەو نهێنییە ئاگادار بم، لە هەر کەسم دەپرسی، دەیانگوت ئەگەر کەسێک دە بارەی پەریاندا شتێک بزانێ، ئەو کەسە تەنیا و تەنیا ماهانە، تۆش ئەوەی کە دەیزانی لە کەسی ئاشکرا ناکەی، بەراستی لەو عۆینەی کە گێراومە شەرمە زارم، نییەتی خراپەم نەبوو هەرچی کردوومە بۆ ئەوە بوو شتێک فێر بم.

دەو ماوەیە دا هەرچی هەوڵم دا دە بارەی پەریاندا هیچم وەگیر نەکەوت، بەڵام لە خەزێنەی زانست و هۆش و لێهاتوویی تۆ ئەو پەڕی کەلک و بەهرەم وەرگرت، ئەو ڕۆژەش کە وە دوات کەوتم تەنیا

مەبەستم ئەوە بوو لە ماڵی حاکم شتێکی تازەت لێ فێر بم، بەڵام وادیارە خوا منی بۆ ئەوە نارد تا گیانی ئەو نەخۆشە لە مەرگ نەجات دەی و ببمە هۆی سەربڵیندیت، ئەوەی دیتت بەرهەمی چاکەی خۆت بوو.

بەختیارم لە وەی بەلانی کەمەوە دە ماوەی خزمەتکاریمدا جارێک بەکارت هاتووم، تاوانم ئەوەیە دەوماوەیە دا لە بەر ئەوەی دیانگوت ماهان زانستی خۆی فێری کەس ناکا بە درۆ خۆم کەڕو لاڵ کرد، دەمەویست فێر بم، نازانم چاکم کردووە یا نا، بەڵام ئێستا تۆ قوتابییەکت هەیەکە دەبەرامبەرتدا دەستەو نەزەر ڕاوە ستاوە و هەست بە سەربڵیندی دەکا، ناویشم ئاشوک نییە، بەڵکوو ڕامانە.

ئەوەی گوت و خۆی دەبەر پێی ماهانی پیر هاویشت و ویستی لاقی ماچ کا.

بەڵام ماهان شانی گرت و ڕاستی کردەوە و نێو چاوانی ماچ کرد وگوتی: قوتابییەکی  وەک تۆ بۆ من جێی شانازییە، قوتابییەک کە دە ڕێی فێربوونی زانستدا ئەو هەموو ڕەنجەی بکێشێ جێی لە سەر سەرانە، لە قسەی خەڵک گەڕێ، من لەوە دەترسام کە زانست و عیلمی من وەگیر ئینسانێکی خراپ و هەلپەرەست کەوێ و خەڵکی پێ  بروتێنێتەوە و دەڕێگەیەکدا دەکاری کا کە بە قازانج و بەرژەوەندی کۆمەڵگای بەشەری نەبێ، بەڵام ئێستا شوکری خوا بە جێ دێنم کە ئینسانێکی چاک و پاک بەهرەی لە زانستی من وەرگرتووە،کە وابێ دەپێشدا سەوادی خوێندن و نوسینت هە بوو؟

**ڕامان گوتی:** بەڵێ قوربان هەرچی کتێبی دە کتێبخانەکەت دان هەموویانم خوێندوونەوە.

**ماهان گوتی:** ئەوانی نێو یەغدانەکانیش؟!

**ڕامان گوتی:** ئی یەکێک لە سندوقەکان کە دەفتەری بیرەوەرێکانتی تێدا، بەڵێ، بەڵام ئەوانی دیکەم نەخوێندوونەوە، من دە پێشدا هەڵوە دای شارەزایی بە ڕێگەی ئاشنایی دە گەڵ پەریان بووم، بەڵام ئیدی ئێستا پێویستییەکم بەو شتە نییە.

ماهان گوتی: کەس پێویستی پێی نییە، بەڵام ئەو ڕۆژانە چیوای نە مابوو دەشک و گومان کەوم، کاکی خۆم پەری ئەو عیلم و زانستەی ئێمەیەکە بەیارمەتی ئەو، بەسەر زۆرگرفتاندا زاڵ دەبین وگرێ کوێرەکانی

ژیانمانی پێ دەکەینەوە، تۆ بە یارمەتی ئەو زانستە خۆت گەیاندووەتە ئەو پلەی کە ئێستا مایەی سەربڵیندی من و بنەماڵەکەتی.

**ڕامان گوتی:** شەرمەزارم لە وەی ناتوانم وەڵامی چاکەکانت بدە مەوە، بەڵام شەرت بێ بۆهەمیشە لایەنگر وخزمەتکاری تۆ بمێنمەوە.

ماهان گوتی: وەڵامی چاکەی من؟ وەڵامی من ئەوە یە، هەرچی فێری بووی دەڕێگەی ئاشتی و بەختەوەری خەڵکدا دەکاری بێنی، من خۆم بە بەختیار دەزانم کە لە داوێنی مەکتەب و تاقیگەوکتێبخانەی مندا زانایەکی وەک تۆ پەروەردە بووە.

ئیدی ئەوەی نازانین کە ژنی حاکم ڕامانی فەرامۆش کرد یا نا، بەڵام لە وەی دڵنیاین کە ماهان و ڕامان تا مان خۆیان بەبەختەوەرزانی.

بەختەوەران کەسانێکن کە زۆرتری دەزانن و زانستەکە یان دەڕێگەی بەرژەوەندی و خزمەت بە کۆمەڵگای بەشەریدا دەکار دێنن.

**چەپکێ گوڵ وچەپکێ نەرگیز مەرگتان نەبینین هەرگیزاوهەرگیز**

## سەرگوزەشتەی ئەو کتێبە

- لەساڵی1359 (1980ی زایینی) ڕاهۆگریم کەوتە سەر کتێبە عیرفانێکان و دەنێو واندا بەرهەمەکانی عەتتاری نەیشابوری سەرنجمی بۆلای خۆی ڕاکێشا هەتا ساڵی 62 خەریکی پشکنینەوە ومتاڵایان بووم و زۆر شێعری پرناوەرۆکم بۆکار لە سەرکردن لێ گوڵبژێر کردن وتوانایی خۆمم لە سەر تاقی کردنەوە.
- چەند ساڵ دواتر زانیم کەسێک بە نێوی مێهدی ئازەریەزدی ئەوکارەی بەر لە من بە زمانی فارسی ئەنجام داوە کتێبەکەیم پەیدا کردو خوێندمەوە و بۆ چونەکانیم پەسەندکرد،کارەکەی خۆمم هەڵوەشاندەوە و لە سەڕا خەریک بومەوە و بۆچونەکانی خۆمم دەنێو بۆ چونەکانی ئەو دا هە ڵشێلا وئەو بەرهەمەی لێ پێکهات.
- ساڵی 65 تەمام گرت ئەوکتێبە بە نێوی ڕامان بە چاپ بگەیێنم، هونەرمەندی دەست ڕەنگین کاک ئەحمەد عەبدوڵڵا زەحمەتی کێشانەوەی ڕو بەرگەکەی بۆ کێشام ،بەڵام دوایە کە گۆڤاری ڕامان لەو دیو دەر چوو لەو ناوە بۆ ئەو کتێبەجاوپۆشیم کرد.
- ساڵی 67 کە تازە ناوەندێکی کامپیۆتێری لە مهاباد بە هیممەتی چەند لاو دامە زرا ئەوکتێبەم بۆتایپ دابەو ناوەندە، بەڵام دەماوە یەکی کورتدا بە هۆی گیروگرفتی ماڵی ئەوناوەندە لێک هەڵوەشاو نوسخەی دەسنووس وتایپکراوی ئەوکتێبەش تێدا چوو وناچار بووم نێو کۆنەکاغەزەکۆنان بگەڕێم وسەرلە نوێ ساغی کەمەوە.
- ساڵی73دووبرای دڵسۆزی بانەییم کاک ئومێدئەحمەدی و کاک بەختیارئەحمەدی بێ هیچ چاوەڕوانی یەک ئەوکتێبەیان بۆ تایپ کردم بەڵام بەداخەوە ئەوفۆنتانەی کەئەوان کاریان پێکردبوو دەبازاڕی تایپ دا باویان نەمابوو ولە مهابادیش بەهۆی تازە بوونی شتێک بەنێوی کامپیووتێر ناوەندەکان شارەزایی گۆڕینی ئەو فۆنتانەیان بە فۆنتی تازە نەبوو شتەکە وەپاش کەوت تاوە کوو کاکە مادح حیکمەت ئارا لە تەورێز زەحمەتی بۆکێشام وگۆڕانکاری پێویستی بۆ پێکهێنام.

- ئاخرین ڕۆژانی زستانی 1383 لەو فۆنتیشڕا هێنامە سەر یۆنیکورد وبۆخۆم وسۆما دەستمان بەهەڵاوێژی کردو ئەو ڕۆ دەبەهاری 1384 دا لێبوینەوە هیوادارم لەبەر زەحمەتی ئەوئازیزانەش بێ ئەوکتێبە کە وەک تەلەسم لێکراوێکی لێهاتووە لەچاپ بدرێ و بەشوێنیدا بەرهەمەنی دیکەشم بکەونە بەر سەرنجی ئازیزان

شادوسەرفەرازبن.

# ناوەڕۆک

| زنجیرە | ناوی کتێب | ناوی نووسەر |ساڵی چاپ |
|---|---|---|---|
| 1) | بەرکوتێکی مەتەڵی فۆلکلۆری کوردی<br>Berkutêkî Metelî Folklorî Kurdê | سەدرەدین نورەدین ئەبوبەکر<br>Sedreddîn Nûreddîn Ebûbekir | 2005 |
| 2) | دەروازەیەک بۆ بۆتەکانی موزیک<br>Derwazeyek Bo Botekanî Muzîk | غەمگین فەرەج<br>Ĝemgîn Ferec | 2005 |
| 3) | وەرز و ساڵنامەی میللی لەپەند و شیعری کوریدا<br>Werzew Salnamey Mîllî Le Pend û Şî'rî Kurdî da | پ . د شوکریە رەسول<br>P.Dr.Şukrîya Resûl | 2005 |
| 4) | لەبارەی کۆکردنەوەی موزیکی میللیدا به زمانی(کوردی عەرەبی)<br>Lebarey Kokirdnewey Mûzîkî Mîllî da | مود کار بلیس و ئەرنولد باکیە.<br>اعداد:د.محمد زازا<br>Maud Karpeles & Arnold Bakê<br>Amadekirdin Be Zimanî E'rebî: Dr. M. ZAZA<br>Wergêrandin bo Kurdî: T. Salîh | 2005 |
| 5) | چلاواز 1 | وریا ئەحمەد | 2006 |
| 6) | پەندی کوردی: چیرۆکەکەی<br>Pendî Kurdî:Çîrokekey | عومەر شێخەڵڵا دەشتەکی<br>U'mer Şeyxella Deştekî | 2006 |
| 7) | هێلکەی نامێ<br>کۆمەڵێك ئەفسانە و حیکایەتی جۆرا و جۆری<br>فۆلکلۆریی نێو کوردەوارییە<br>بەرگی یەکەم/ بەشی یەکەم<br>Hêlkey Namî<br>I | مەولود ئیبراهیم حەسەن<br>Mewlûd Îbrahîm Ĥesen | 2006 |

| | | | |
|---|---|---|---|
| 2006 | مەولود ئیبراهیم حەسەن<br>Mewlûd Îbrahîm Ĥesen | هێلكەی نامێ<br>كۆمەڵێك ئەفسانە و حیكایەتی جۆرا و جۆری<br>فۆلكلۆریی نێو كوردەوارییە<br>بەرگی یەكەم/ بەشی دووەم<br>Hêlkey Namî<br>II | 8) |
| 2006 | گۆنا قادر<br>Gona Qadir | خصائص أغاني الأطفال<br>في كوردستان العراق<br>Goranî Mindalan Le Kurdistanî Îraq | 9) |
| 2006 | هەردەوێل كاكەیی<br>Herdewêl Kakeyî | پەندو قسەی نەستەقی ماچۆ<br>Maço | 10) |
| 2006 | جەمال گردەسۆری<br>Cemal Girdesorî | سەربردەی كوردەواری<br>Serbirdey Kurdewarî | 11) |
| 2006 | مووزیك و دابەش كردن :<br>احمد جوادی<br>سۆلیست:سیروان سیرینی<br>Mûzik û Dabeşkirdin: Ehmed Cewadî<br>Solîst: Sîrwan Sîrînî | كوردستان سمفۆنیك سویت<br>Kurdistan Simfonîq Swît | 12) |
| 2006 | جەلال مەلا حەسەن،<br>جەنگی جەلال<br>Celal Mela Ĥesen & Cengî Celal | مریەم خان<br>Miryem Xan | 13) |
| 2006 | رەسووڵ رەش ئەحمەدی<br>(هەڵوەدا مهابادی)<br>Resûl Reş Ehmedî (Helweda Mihabadî | گۆزەی شكاو<br>Gozey Şikaw | 14) |
| 2006 | الدكتور عمر ابراهیم :<br>عزیز(پەتی) | القیم السائدة<br>ي القصص الشعبية الكوردية و العربية للأطفال في<br>العراق | 15) |